لە بڵاوكراوەكانی دەزگای نوری حیكمە بۆ پەروەردەو ڕۆشنبیری - ژمارە (51)
نوسینگەی سەرەكی / هەولێر

# تیسير الرحمن

## لە زانستی جوان خوێندنەوەی قورئان

قۆناغی یەكەم





نوسین و ئامادەكردنی : توفیق صدیق حمد

چاپی دووەم

# تيسير الرحمن

لەزانستی جوان
خوێندنەوەی قورئان

## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: (تیسیر الرحمن ) لە زانستی جوان خوێندنەوەی قورئان

نووسین و ئامادەکردنی : توفیق صدیق حمد

دیزاین: زانا احمد کریم

تایپ: هێمن برهان

پێداچوونەوە و دیزاینی بەرگ : بەشی ڕاگەیاندنی دەزگای نوری حیکمە

ژمارەی لاپەرە : ٢١٨ لاپەڕە

لەبڵاوکراوەکانی دەزگای نوری حیکمە

بۆ پەروەردەو ڕۆشنبیری - ژمارە (٥١)

چاپی دووەم ٢٠١٩ میلادی - ١٤٤١ هیجری

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە سپاردنی (٦٧٥)ی ساڵی ٢٠١٤ی پێدراوە

# تیسیر الرحمن

## لەزانستی جوان
## خوێندنەوەی قورئان

نووسین و ئامادەکردنی
توفیق صدیق حمد

مۆڵەت پێدراو لەقیرائەتی (السَّبعة)
لەڕێگەی (الشاطبية)

# پێشەکی

## د. عبدالله حداد

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على خاتم الأنبياء والمرسلين وعلى آله وصحبه أجمعين

قورئانی پیرۆز کە فەرمودەی (رب العالمين)ـە و تیایدا فەرمانی کردوە بە چۆنیەتی خوێندنەوەی وەکو لە ئایەتی ژمارە (٤)ی سورەتی (المزمل) دا دەفەرموێ ﴿وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا﴾ واتە : قورئان بخوێنەوە لەسەرەخۆ و پیتەکان و بزوێنەکان بەدیاربخە.

ئێمە لە دەزگای نوری حیکمە بۆ پەروەردە و ڕۆشنبیری لە دوای ئەوەی بەفەزڵی پەروەردگاری جیهانیان ژمارەیەکی بەرچاو لە گەنجان و نەوجەوان و منداڵان لە هەردوو ڕەگەز روویان تێکردین بە مەبەستی فێربوونی خوێندنەوەی راست و دروستی قورئانی پیرۆز و لەبەرکردنی، بەپێویستمان زانی مەنهەجێکی تایبەت بە دەزگامان هەبێ سەبارەت بە ئەحکامەکانی تەجوید تاوەکو لە نوسینگەی سەرەکی و گشت لقەکانی دەزگا پێ یەوە پابەند بین، بۆ ئەو مەبەستەش داوامان لەبرای خۆشەویستمان مامۆستا توفیق کرد کە چەندین ساڵە خەریکی ئەم زانستە پیرۆزەیەو مۆڵەتپێدراوە لە (القراءة السبعة) بەو کارە هەڵبستێ، ئەویش خوا پاداشتی خێری بداتەوە وەڵامی داواکەی ئێمەی دایەوەو هەڵسا بە نوسینی ئەم پەرتوکە بە زمانی شیرینی کوردی کە لە چەندین سەرچاوەی باوەڕپێکراوی ئەم زانستە کۆی کردۆتەوە، دواتر داوامان لەهەر سێ مامۆستای شارەزا لە زانستەکانی تەجوید و قیرائات کرد بەرێزان (مامۆستا دلێر گەرمیانی و مامۆستا د.دیاری و مامۆستا حەمزە) پێداچونەوە بەو کتێبە بکەن و لە رووی زانستی یەوە و

هەڵی سەنگێنن، ئەوانیش خواپاداشتیان بداتەوە وەڵامیان داینەوە و بە ووردی پێداچونەوەیان بۆ کرد و تێبینیەکانیان بۆ ناردین، دواتر لە دەزگا لێژنەیەك راسپێردرا بە ئەندامێتی بەڕێز (ماموستا توفيق ) بۆ پێداچوونەوەی کۆتایی بە کتێبەکە بەلەبەرچاوگرتنی تێبینیەکانی هەرسێ ماموستای بەڕێز .

بۆیە ئێمە بڕیارمان دا وەکو مەنهەجی دەزگا لە رووی زانستی تەجویدەوە کاری پێبکرێ، وە ئاموژگاری هەموو فێرخوازێکی زانستی تەجوید بەزمانی شیرینی کوردی دەکەین کە سوودمەند بێت لەو بەرهەمە ناوازەیەی کە بێگومان کتێبخانەی کوردی پێ رازاوەتەوە.

لە کۆتایی دا دەست خۆشی لە برای بەڕێزمان (ماموستا توفيق ) دەکەین و لە خوای موتەعال داواکارین بەو بەرهەمە تەرازوی چاکەکانی لە قیامەتدا قورس بکات و بەرەکەت بخاتە کاروکردەوەکانی.

هەروەها دەست خۆشی لە هەر سێ ماموستای بەڕێز (ماموستا دلێر گەرمیانی و ماموستا د.دیاری و ماموستا حەمزە) دەکەین کە پێداچوونەوەی ووردیان بۆ کتێبەکە کرد و بە سەرەنج و تێبینیەکانیان دەوڵەمەندیان کرد خوا پاداشتیان بداتەوە.

وصلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

د.عبدالله حداد

سەرۆکی دەزگا

چوارشەممە ٣ ذی القعدة ١٤٣٨ کۆچی

بەرامبەر ٢٦ تموز ٢٠١٧ زایینی

## پێشەکی
## د. دیاری أحمد قصاب

قورئانی پیرۆز گەورەترین دیاریی خوای گەورەیە بۆ بەندەکانی.. موعجیزەی گەورەی پێغەمبەری ئیسلامە (ﷺ): ﴿أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ العنكبوت : ٥١ . کتێبێکی پیرۆز و پڕ خێرە، بە شوێنکەوتنی مرۆڤەکان سەربەرزی هەردوو دونیان ﴿وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ فَٱتَّبِعُوهُ وَٱتَّقُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ الأنعام : ١٥٥. ئەو کتێبە، نەک تەنها موسڵمانان، بەڵکو گشت مرۆڤایاتی ڕزگار دەکات گەر شوێنی بکەون، لە تاریکیەکانەوە بەرەو ڕۆشنایی باوەڕ و بەختەوەری دەیان بات: ﴿الٓر ۚ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ﴾ إبراهيم : ١.

فەزڵی خوای گەورەیە کە بە ئێمەی مرۆڤی لاوازی بەخشیوە، وتەکانی بڵێینەوە و لە سنگی قورئانخوێناندا جێگای بێتەوە.. ئەو وتانەی، لە گەورەییاندا، گەر بەسەر شاخەکاندا دابەزیبانایە ورد و خاش دەبوون: ﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُۥ خَٰشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ۚ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ الحشر : ٢١، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ﴾ القمر : ١٧. فەرمانیشی پێ کردووین کە قورئان بەجوانیی بخوێنینەوە:

﴿وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا﴾ المزمل : ٤.

هەر کەسێك، هەر کۆمەڵێك، لەخزمەتی ئەم قورئانەدا بن، ئەوە جگە لەوەی خێرێکی گەورەیان دەستکەوتووە، کۆمەڵگا و مرۆڤایەتی بەگشتی

سوودمەند دەکەن، چونکە خۆشیی و کامەرانی و خۆشگوزەرانی تەنها لە شوێنکەوتنی فەرمایشتی بەدیهێنەری مرۆڤە..
دەزگای نوری حیکمە، یەکێکە لەو ناوەندە موبارەکانەی کە هەر لە سەرەتاوە و بەردەوام لە خزمەتی قورئاندا بووە، بۆتە مایەی خێر و بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری ئیسلامیی و ئاکاری جوان و بەرزی موسڵمانانە لە زۆربەی شوێنەکانی وڵاتە خوشەویستەکەماندا.. داواکارم لە خوای گەورە ئیستیقامەیان پێ ببەخشێت و سەرکەوتوویان کات لە کارەکانیاندا.
دووای ئەوەی برایانی دەزگای نوری حیکمە داوایان لێکردم کە بە کتێبی (تیسیر الرحمن لە زانستی جوان خوێندنەوەی قورئان)ی دانراوی برای بەڕێز (مامۆستا توفیق صدیق)دا بچمەوە، کە وەك پڕۆگرامێك دانراوە بۆ قوتابیانی قورئان، بەخۆشحاڵیەوە خوێندمەوە و سەرنج و تێبینیەکانم دانێ، کە زۆربەی لە دووای ئەزموونێکی چەند ساڵەمان بوو لە وتنەوەی ئەم زانستە و قیرائاتی قورئاندا، بەسوپاسەوە وەریانگرت.
تێبینی دەکرێت کە بابەتی وتنەوەی قورئان بە ڕێگە ڕاست و دروستەکەی و بە سەنەدی نەبچراو، بۆ ماوەیەکی زۆر لە کوردستاندا بوونی نەبوو، مەگەر بەشێوەیەکی لاوەکی، بەڵام لەم چەند ساڵەی دووایدا – سوپاس بۆ خوا – ئەم زانستە جارێی تر بە گەرموگوڕیی هاتۆتەوە ناومان و چەندین مامۆستای شارەزا و بنکە و ناوەندی فێرکردنی قورئان لە هەرێمەکەماندا بڵاوبۆتەوە، کە مایەی خۆشیی و شانازییە، چونکە قورئان، لەگەڵ بوونی مەنهەج و کتێبی باش، دەبێت بە دەماودەم وەربگیرێت..
لەم کتێبەدا ڕەچاوی قۆناغبەندی و پێویستیی قوتابیان کراوە لەو بڕەی کە پێویستە فێری ببن، هەروەها هەندێك ئیزافەی تێدایە کە لە هەندێ کتێبی تردا نیە، کە ئەمانە جێگەی دەستخۆشییە لە مامۆستای نووسەر و برایانی دەزگا. داواکارم لە خوای گەورە ئەم کارەیان بخاتە تەرازووی چاکەکانیانەوە، نەوەیەکی قورئانیی ناوازە لە کوردستاندا دروست ببێت و ببنە سومبوولی پێشکەوتن و چاکەکاریی و چاکخوازیی..


د. دیاری أحمد قصاب
الجامع للقراءات الأربع عشرة
السليمانية

## پێشەکی
## مامۆستا دلێر گەرمیانی

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على خير خلق الله محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

و بعد:

پاش ئەوەی کتێبی (تیسیر الرحمن لەزانستی جوان خوێندنەوەی قورئان)م خوێندنـەوە کـە لـە نوسـین و ئامادەکردنـی بـرای بەرێـزم مامۆسـتا (توفیـق صدیـق حمد)ەو کتێبەکـەی بۆ دوو قۆناغـە، قۆناغی یەك و دوو، بۆم دەرکەوت ئەو بابەتانەی کە گرنگەو قوتابی قورئان پێویسـتی پێیەتی بەروونـی و لەگـەڵ نموونـەو وێنـەدا هێناویەتـی، وەخـۆی پاراسـتووە لە درێژکردنەوەیەکی بێ سوودی ماندووکەر وە ئەوەندەش کورتی نەکردۆتەوە کە لەسوودی زانستەکە بفەوتێنی.

خوای گەورە پاداشتی بەخێری بداتەوە بۆ ماندوو بوونی و خزمەت کردنی بەقورئانـی پیـرۆز و مەکتەبەی کوردی داواکارم لە خودای گەورە قورئانی پیرۆز بکاتە شفیع و تکاکار بۆ هەمووولایەکمان.

وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين

٢١ / ذي القعدة / ١٤٣٧

دلير أحمد محمد

## پێشەکی

## مامۆستا حمزة عبدالرحمن صۆفی

الحمد لله رب العالمين الذي أنزل القرءانَ وَلَمْ يَجْعَل لَهُ عِوَجَا، أمرنا بترتيله وتدبيره، فهو خير كتاب أنزله الله على خير البشر ليكون منهجا لخير أمة أُخْرِجَتْ للناس، فجعل صفة الخيرية مستديمة الحاملية والصلاة والسلام على الحبيب المصطفى، خير من تلا القرءان، وقام به أكمل قيام حيث كان خلقه القرءان، وعلى آله وأصحابه وأتباعه الى يوم نلتقى فيه الرحمن الرحيم.

لەپاشان...

دوای چاو خشاندنەوەم بەم پەرتووکە بەسوودە لە سەر داوای دانەری پەرتووك مامۆستا (توفيق صديق حمد خۆشناو) بینیم کە بەدارشتنێکی جوان شێوازێکی ئاسان بۆ تێگەیشتن لە زانستەکانی قورئان، بەم دابەشکردنەی بۆ دوو قۆناغە کە دەکرێت فێرخوازانی قورئان لەهەردوو قۆناغە کە سودێکی زۆری لێ ببینن چونکە دیارە ماندووبوونێکی تەواوی پێوە دیارە لەکۆکردنەوەو دانانی ئەم پەرتووکە زانیاری وردی تێدایە دەکرێت لەهەردوو قۆناغە کە سوودی لێ وەربگیرێت.

لەڕاستیدا ئەم جۆرە کارانە جێ ی شانازین کە مامۆستایەکی خزمەتکار بەقورئان هەڵبستێت بە روونکردنەوەی یاساکانی جوان خویندنەوەی قورئان بەزوبانی شیرینی کوردی بەناوی (تيسير الرحمن لەزانستی جوان خوێندنەوەی قورئان) ناوێکە لەجێگای خۆیەتی، داواکارم لە خودای میهرەبان ئەم کارە پیرۆزەی بۆ بخاتە تەرازووی چاکەکانی لە رۆژی دوایی کە جێگای دەست خۆشیە.

خزمەت کاری قورئان

حمزة عبدالرحمن صوفی خۆشناو

رێپێدراو لەقرائاتی عشر

لەرێگەی شاطبية و طيبة النشر

# سوپاس وپێزانین

بەنـاوی خـۆم و بەنـاوی دەزگای نـوری حیکمە بۆ پەروەردەو رۆشـنبیری ئەو پەڕی سـوپاس و پێزانینی خۆمان ئاڕاسـتەی ئەم بەڕێزانەی خوارەوە دەکەین:

- مامۆسـتای خۆشەویسـت (دلێـر أحمـد محمد) دەکەین، کـەوا ماندوبوو لـە نوسـینی پێشـەکی یەکـەی و پێداچوونەوەو رەخنە بـە نرخەکانی کـە بوونـە هـۆکار بۆ زیاتـر دەوڵەمەندتر کردنـی بابەتەکانی ناو ئەم پەرتووکە .
- هەروەها سوپاسی بێ پایانمان بۆ مامۆستای لە دڵا شیرین (د.دیاری أحمد قصـاب) هەیە. کەوا ماندوبوو لـە پێداچوونەوەو رەخنە بە نرخەکانی کـە بـووە هۆکارێك بۆ زیاتر دەوڵەمەندتر کردنـی بابەتەکانی ناو ئەم پەرتووکە.
- هەروەها سوپاسی مامۆستای زۆر بەڕێزمان (حمزة عبدالرحمن صۆفی) دەکەیـن، کـەوا ماندوبوو لە پێداچوونەوەو، نوسـینی پێشـەکی بۆ ئەم پەرتووکە.
- هەروەها سوپاسی هەموو ئەو برا بەڕێزانە دەکەین کە هاوکارمان بوون بەهەر شێوەیەك بەتایبەتی ئەوانەی لە کاتی نوسیندا یارمەتیان داین .
- داوا لـە خـودای بەخشـندەو میهرەبان دەکەین کەوا پاداشـتی چاکەیان بداتـەوە لـە رۆژێ کـە هیـچ شـتێ بـە هانـای بەنـدەوە نایـەت تەنها کردەوەکانی نەبێت ...

اللهم امين

# پێشەکی دانەر

﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَـٰبَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا ﴾ الكهف : ١

والصلاة والسلام على رسـول الله(ﷺ) وعلى اله وأصحابه ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين، أمّا بعد:

سـوپاس بـۆ ئـەو خودایـەی کـە قورئانی پیرۆزی بۆ سـەر بەنـدەی خۆی محمد(ﷺ) ناردە خوارەوە.

هیـچ جـۆرە لاری و چەوتـی یەکـی دانەنـاوە بـۆ قورئانـی پیـرۆز، بەڵکو جێگیرو راست و دروستە، سڵاو لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) و یاوەران و بنەماڵە و شـوێن کەوتووانـی ئەوانـەی بە ڕاسـتی پەیرەویان لێ کـردو لێی دەکەن تا رۆژی دوایی، پاشـان هەموو سـوپاس و سـتایش وسـوپاس گوزاری هەر بـۆ خـوای پـەروەردگارە، لە سـەر دۆزینـەوەی رێی راسـتی و هیدایەت بۆ کارکـردن وخزمەت کردنی زانسـتی جـوان خوێندنـەوەی قورئانی پیرۆز، هـەروەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمـوێ: ( خَيرُكُم مَنْ تَعلَّمَ القُرآنَ وَعلَّمَه ) رواه البخاري.

واتە : چاکترین و باشترینتان ئەو کەسانەن کە قورئان فێر دەبن خەڵکانی تریش فێر دەکەن.

بە پێی ئەم فەرمودەیە گشت مامۆستایان و فێرخوازانی بەڕێز دەگرێتەوە کـە لەماوەی ژیانیان بە دڵسـۆزی دەنگ و قوڕگـی خۆیان بە کارهێناوە بۆ

فێربـوون و فێرکردنـی خەڵکانـی تـر، کە پێغەمبەر(ﷺ) نـاوی ئەو جۆرە کەسـانە بـە باشـترینی مرۆڤـەکان ناودەبات، وە پلەو پاداشـتی ( زانا ) بە قورئانی پیرۆزیان پێدراوە، ئەوەی قورئان بە پچڕ پچڕ دەخوێنێتەوە لەبەر قورسـی لەسـەر زمانی پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ : ( کەسی زانا بە قورئانی پیرۆز لەگەڵ فریشتە پاك و بەرزەکانن، وە ئەوەشی بە پچڕ پچڕی و قورسی دەیخوێنێتەوە و لە سەریشی قورسە ئەوا دوو پاداشتی هەیە ) خۆش بەختی بۆ ئەوکەسـەیە کە بە دڵسـۆزی کارەکان دەکات بۆ خوای پەروەردگار، خوای گـەورە دەفەرمـوێ: ﴿أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ﴾ الزمر:٣.

واتە : هۆشیار و ئاگادار بن ئەی خەڵکینە پەرستن بە پوختی و پاکی هەر بۆ خوای پەروەردگار دەبێت.

جـا خوێنـەرە بەرێز و خۆشەویسـتەکان ئەم پەرتووکەی لە بەردەسـتتان دایە لە سـێ بەشـی سـەرەکی پێك هاتـووە، یەکەمیان دەرچـەی پیتەکان، دووەمیـان سـیفەتی پیتەکان ( المخـارج و الصفـات )، سـێیەمیان حوکمی نونی سـاکن و میمی سـاکن و پلەکانی مینگە (غنة)، لەگەڵ چەند تێبینی و روونکردنەوەیـەك کـە پێویسـتە فێرخـواز وریا بێت لەم جـۆرە هەڵانە کە بە شـێوازێکی ئاسـان باسمان کردووە، بۆ ئەوەی فێرخواز زیاتر گرنگی ئەو زانسـتەی بۆ ئاشـکرا بێ کە دەیخوێنێت لە چۆنیەتی دەربڕینی وشەو پیتەکانـی قورئانـی پیـرۆز بـە دەربڕینێکـی راسـت و رەوان، وەك چـۆن پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەری بڕیوە.

وە هێنانەوەی نموونە لە قورئانی پیرۆز بۆ هەر پیتێك لە پیتەکانی زمانی عەرەبـی بـۆ کـردار و جێ بە جێ کـردن (عملي) کە پێویسـتە فێرخواز شـوێنی دەرچوونـی پیتـەکان و سـیفەتەکانیان بزانێـت و دەری ببڕێت و

بێ ئـەوەی زیادەڕۆیی و سـتەم لە پیتەکان بکات و قورسـایی و ناخۆشـی لـە سـەر خوێندنەوەکـە دروسـت بکات، رەنـگ کردنی بابەتـەکان بۆ لێك جیاکردنەوەیان بۆ ئەوەی بەرچاوی خوێنەر روون بێت لە تێگەیشتن وە دانانی خشتەکان بۆ ئاسان کردن و زووتر وەرگرتنی بابەتەکان، ئەم کارانە هەموو بۆ خزمەتکردنی مامۆسـتاو فێرخواز و زانسـتخوازی خۆشەویستە.

لـە کۆتایـی دا داواکارین لە خوای پەروەردگار کۆتــــا سـاتەکانی ژیانمان بەخێر بگێرێت و لە گوناه و تاوانی دایك و باوك و مامۆستاکانمان و گشت مسولمانان خۆش بێت...

اللهم آمین

﴿رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ﴾ الحشر: ١٠.

توفيق صديق حمد

ايلول ١٩ / ٩ / ٢٠١٤ م

ذو القعدة ٢٤ / ١١ / ١٤٣٥ ك

هەولێر

## ژیان نامەی حەفص و گەیشتنی سەنەدی بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)

أ- پێکەوەگرێ دانی سەنەدی قورئانی پیرۆز مەرجێکە لە مەرجەکانی جوان خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز، ئەوەش لە کارە هەرە گرنگەکانە بۆ هەر کەسێك قورئانی پیرۆز دەخوێنێتەوە، ئەوەشی خۆی ماندوو ئەکات بۆ ئەوەی سەنەدی بەرز بە دەست بهێنێت ئەوا لە خوای گەورە نزیك دەبێتەوە، وەك ئەوەی (زید بن ثابت) (رضي الله عنه) دەفەرموویت : (خوێندنەوە سونەتێکی بەردەوامە یەك لە دوای یەك وەری دەگرن ).

سەلەفی صالح دەیان فەرموو : سەنەد لە دینەوەیە، وە سەنەدیش نەبوایە هەر کەسێ بە ویست وئارەزووی خۆی قسەی دەکرد، بۆ مرۆڤیش شەرەف و سەربەرزیە کە لە خوارەوە بەرز ئەبێتەوە بۆ سەرەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) کۆتایەکەشی لە لای خواوە دەبێت، بۆیە قورئان خوێنەکان (القُرّاء) سەنەدیان گەیشتۆتە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەرئەوانیش بەڵگەن بۆ ئێمە لەڕاستی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز هەروەك بەو شێوەیەی پێغەمبەر(ﷺ) خوێندویەتیەوە.

ب- (حفص بن سليمان بن مغيرة ابو داود الاسدالكوفي) کوڕی خێزانی (امام عاصم) بووە، جێگای متمانە و دامەزراو لێزان ( مُتقِن و حافِظ ) بووە، لە بەغدا و مەککە و کوفە خوێندویەتی، و لە ساڵی ٩٠ك لە دایك بووە و لە ساڵی ١٨٠ك کۆچی دوای کردوە.

ج- (حفص) لە لای (امام عاصم) خوێندویەتی و (امام عاصم)یش لای (ابو عبدالرحمن السلمي) خوێندویەتی و ئەویش لە لای (عثمان بن عفان) خوێندویەتی و لای (علی بن ابي طالب) و (زيد بن ثابت) رەزا و ڕەحمەتی خوایان لە سەر بێت و گشتیان لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) خوێندویانە.

د- شێوەی خوێندنەوەکانی (حفص) لە (امام عاصم) لە هەموو وولاتانی

ڕۆژهـەڵات بـڵاو بۆتــەوە، لە عێراق و شـام و هیند و پاکسـتان و تورکیا و ئەفغانستان و زۆربەی وولاتان.

ت- (حفص) و ئەوانی تریش هیچ دەستێکیان نی یە لە دارشتن و دروست کردنی خوێندنەوەکان و ( تەجوید ) کردنیان، چونکە هەموو خوێندنەوەکان (وحي) سروشـی خوداییـن بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەوانیش تەنها سـەنەدەکانیان بـۆ گەڕاوەتـەوەو دواتـر بـە ناوبانگ بوینە بـەو شـێوە خوێندنەوەیە، وە خەڵکیش بەم شـێوە لێیانی وەرگرتووەو شـێوەی خوێندنەوەکەیان داوەتە پاڵ ئەوان بۆیە دەڵێن گێڕانەوەی (حفص) خوێندنەوەی (عاصم) بە هەمان شـێوە قورئـان خوێنەکانـی تریـش لە بەر ئـەوەی خۆیان بـۆ خوێندنەوە تەرخان کردوە و تێیدا بە ناوبانگ بووینە.



**گێڕانەوەی ( حفص ) : لە ( امام عاصم ) لە ( ابوعبدالرحمن السلمي ) و لە ( علي بن ابي طالب ) لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە جبریلەوە لە خوای گەورەوە:**



# ئادابەکانی قورئان خوێندن:

١- دەست نوێژ شوشتن پێش خوێندنی قورئان.

٢- سیواك کردن پێش خوێندنی قورئان.

٣- پاك و خاوێنی شوێن لە کاتی قورئان خوێندن.

٤- خوێندنی قورئان بە دڵ ئارامی و بە خشوع.

٥- گوتنی (استعاذة) ، ﴿أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ .

وەك خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ النحل: ٩٨ . واتە: ( کاتێك قورئانت خوێند و دەورت کردەوە، ئەوا پەنا بگرە بە خوا لە شەیتانی نەفرین لێکراو ).

٦- گوتنی (بسملة) ، ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ لە سەرەتای هەموو سورەتەکان، تەنها لە سەرەتای سورەتی (التوبة) نەبێ.

٧- خوێندنی بە جوانی و ڕێکی واتە بە تەرتیل و دەنگێکی خۆش بخوێندرێت، وەك خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا﴾
هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ : ( زَيِّنُوا القُرآنَ بأصواتِكُم
رواه إبن حبان وذكره الألباني في سلسلة الاحاديث الصحيحة (٢ / ٢٧٠ ).
واتە : قورئان بڕازێننەوە بە دەنگەکانتان.

٨- خوێندنی بە تێڕامان و لێ وردبوونەوە، وەك خودای گەورە دەفەرموێ:

﴿كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾ ص: ٢٩.

واتە: ( ئەم قورئانە کتێبێکی پیرۆزە دامان بەزاندووە بۆ لای تۆ، بۆ ئەوەی ئایەتەکانی لێك بدەنەوە و بیری لێ بکەنەوە و بۆ ئەوەی خاوەن بیر و هۆشەکان پەند و ئامۆژگاری وەربگرن و تێفکرن ).

٩- قورئان خوێن هەوڵبدات ئایەتەکانی ترساندن و موژدەپێدان کاری

تێبکەن، ئەم جۆرە کردارەش سیفەتی مرۆڤی باوەڕدارە، خودای گەورە دەفەرموێ:

﴿وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ الأنفال: ٢.

واتە : ئیماندارانی راستەقینە ئەوانەن کاتێك ئایەت و فەرمانەکانی ئێمەیان بە سەردا بخوێنرێتەوە ئەوە ئیمان و باوەڕیان زیاد دەکات، (لە هەموو کار وبارێکیشیاندا) هەر پشت بە پەروەردگاری خۆیان دەبەستن.

١٠- ئەگەر کات و شوێنەکە گونجاو و لە بار بوو بە ئاشکراو بە دەنگ بخوێنێ چونکە دڵ بێدار دەکات و مرۆڤ چالاك دەکات، ئەگەر زانی ئازاردانی نوێژخوێنانی تێدا دەبێ ئەوا واچاکە بەبێ دەنگی و بە پەنهان بیخوێنێ، ئەبو هریرە(رضي الله عنه) دەفەرموێ : گوێم لە پێغەمبەر بوو (ﷺ) فەرمووی: (لَمْ يَأْذَنِ اللهُ لِشَيْءٍ مَا أَذِنَ لِلنَّبِيِّ (ﷺ) يَتَغَنَّى بِالْقُرآنِ يَجْهَرُ بِهِ).

واتە : خوای گەورە لە هیچ کارێك وا بە چاکی گوێ ناگرێ وەك گوێ دەگرێ لە پێغەمبەرێکی دەنگ خۆش یان قورئان خوێنێکی دەنگ خۆش کە بە ئاوازێکی جوان و خۆش قورئان بخوێنێ و بە شەوقەوە دەنگی لێ هەڵبڕێ.

١١- ئەگەر بە ئایەتێك رەت بوو تەسبیحاتی تێدا بوو (سبحان الله) بکات، پرسیار و داوای تێدابوو پرسیارو داوا بکات، خۆپەناگرتنی تێدابوو پەنابگرێ و ئەگەر (سوژدە) ی تێدا بوو (سوژدە) ببات.

# دەستپێک

هەموو زانستێك بەر لە چوونە ناوی یەوە چەند بنەماو پێشەکی یەکی هەیە، زانایان بە دە بنەما دەیژمێرن پێویستە فێرخوازان ئاشنایی لەگەڵ ئەو زانستە دروست بکەن تا زیاتر گرنگی ئەو زانستەیان بۆ ئاشکرا بێت کە دەیخوێنن، هەندێ لە توێژەرەوان لە زانستی (تجوید) تەنها هەندێکی باس دەکەن نەك گشتی، بەڵام ئەوەی هەموو خاڵەکان بزانێت ئەوا شەرەفی زانست و زانین وەردەگرێت.

ئێمەش لێرەدا ئەو دە بنەمایە بە کورتی باس دەکەین :

## یەکەم : پێناسە ( التعریف ) :

(**تەجوید**) لە زمانەوانیدا : واتە: چاك کردن.

لەزاراوەدا : زانستێکە مەبەست تێیدا هەموو پیتێك ماف[1] و ئەوەی شیاوەبۆی[2] لە چۆنیەتی دەرچوون و سیفەتی پیتەکان و وەستان و دەست پێ کردن وەردەگرێت بێ هیچ خۆ ئازاردانێك و قورس کردنێك لە سەرخۆ بەو شێوەی کە هاوەڵان لە پێغەمبەر(ﷺ) وەریان گرتووە.

(ابن الجزري) دەفەرموێ: (تجوید) رازاندنەوەو جوان خوێندنەوەی قورئانە، (تجوید) پێدانی ماف و پلەی پیتەکانە بە پیتەکان و، گەڕانەوەی پیتە بۆ دەرچەی سەرەکی خۆی، لکاندنیەتی بەهاوشێوەی خۆی، راستکردنەوەی دەربڕینی پیت و، ورد خوێندنەوەیەتی بەپێی سروشتی خۆی و، تەواوی چۆنیەتییەکەی، بەبێ سنور بەزاندن و خۆنارەحەت کردن، بەبێ زێدەڕۆیی و زۆر لەخۆ کردن.

---

١) ماف ( حقّه ): بریتیە لە پێدانی مافی هەموو پیتێك و دەرچوونی لە شوێنی خۆی، وەپێدانی سیفەتە بنەڕەتی یەکان کە لە پیتەکە جیا نابێتەوە، وەك : ( الهمس ، الجهر ، الشّدة ، الرخوة ، الإستعلاء، الإستفال ، الإطباق ، الإنفتاح ، الإصمات ، الإذلاق ، الصفير ، القلقلة ، الإنحراف ، اللين ، التكرير، التفشّي ، الإستطالة) + الغنة، الخفاء.

٢ ) ئەوەی شیاوەبۆی ( مستحقة ) : بریتیە لە پێدانی ئەو سیفەتانەی کە تووشی دێت (عارضة) وەك: (التفخیم، الترقيق ، الإدغام ، المدّ ، السُّكون ، السَّكت).

**دووەم: بابەتی زانستی تەجوید (المَوْضُوعُ) : بریتیە لە وشە پیرۆزەکانی قورئانی پیرۆز.**

**سێ یەم : بەرووبومی زانستی تەجوید (الثَّمَرَة) :**

بریتیە لە پاراستنی زمان لە هەر هەڵەیەك لە کاتی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بە ئومێدی بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە . وەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللَّهِ أَكْبَرُ﴾ التوبه: ٧٢.

واتە : ڕەزامەندی خوای پەروەردگار لە هەموو نازو نیعمەتەکانی بەهەشت بە نرخترو گەورەترە.

**چوارەم: نرخ و بەهاکەی (فَضْلُهُ) :**

زانستی (تجوید) بەنرخترین و بەرزترین زانستە، چونکە بەستراوەتەوە بە بەرزترین و چاکترین پەرتوکی سەر ڕووی زەمین کە قورئانی پیرۆزە.

**پێنجەم : پەیوەستی بەزانستەکانەوە (نِسْبَتُهُ) :**

واتە: بۆ کام زانست دەگەڕێتەوە و جیاوازی لە گەڵ زانستەکانی تر چی یە؟ ئەم زانستە جیاوازە لە هەموو زانستەکانی تر، لەم زانستە مرۆڤ چاك شارەزا نابێت بە بێ بوونی مامۆستایەکی شارەزا و پسپۆر.

**شەشەم: دانەر (الواضِعُ) :**

دانەری زانستی (تجوید) وەك بنەما و نەزەری کە لە کەسانی شارەزا لە بواری خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز خاوەنانی ئەو هونەرە پیرۆزەن، کە دەتوانین ناوی لێ بنێین زانستی دەرك پێ کردن و هەست پێ کردن، بەڵام لە رووی گێرانەوەو ریوایەتی ئەو زانستە سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سروش و وەحی یەی کە بۆ پێغەمبەرمان(ﷺ) دابەزیوە.

سەرەتای دیار کەوتنی زانستی (تجوید)یش وەك ماف دان بە پیتەکان

و سیفەتەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ زانایانی دانەری زمانی عەرەبی، وەك: (خلیل بن أحمد الفراهیدی) قوتابیەکەی (سِیبْویهِ)، پاشان وەك زانستێکی سەربەخۆ دیار کەوت بە ناوی زانستی (تجوید)، و لە سەر لاپەڕەکانی ئەو پەرتوکانەی لە سەدەی سێ یەم و چوارەمی کۆچی نووسراوە، یەکەم کەسیش کە پەرتوکی لەم زانستە نوسیوە ئیمام (موسی خاقان)ی یە لە سالی ( ٣٢٥ ك ) کۆچی دوایی کردووە .

## حەوتەم : ناو (الاسمُ) :

ناوی زانستی (تجوید)ە، هەندێکی تر ناوی دەبەن بە (فَنُّ التَّرتیل) و هەندێکی تر ناوی دەبەن بە (حَقُّ التِّلاوة).

## هەشتەم: سەرچاوە و ڕەچەڵەکی (الاسْتِمْدَادُ) :

سەرچاوەگەی دەگەڕێتەوە بۆ قورئانی پیرۆز کاتێك خوای گەورە دەفەرموویێت:﴿وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا﴾ المزمل : ٤.

واتە: دەوری قورئان بکەوە لە سەرخۆیی و بە ڕێك و پێکی، هەروەها سەرچاوەیەکی تری زانستی (تجوید) کار و کردارەکانی پێغەمبەرە(ﷺ)، چۆن پێغەمبەر هاوەڵەکانی فێرکردووە ئەوانیش پارێزگاریان لێ کردووە تا گەیشتۆتە دەست زانایان و شارەزایان لە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز و گەیشتۆتە ئێمە بە سەنەدێکی یەك لەدوای یەك (المُتَواتِر) کەژمارەیەکی زۆرلە خۆدەگرێتەوەلەگێرانەوەی.

## نۆیەم: حوکمی شەرعی ئەم زانستە دەکرێتە دوو بەش (حُکمُ الشارِعِ) :

### بەشی یەکەم : تەجویدی تیۆری (نظـري) :

بریتیە لە هەبوونی زانست بە بنەماکانی ( تجوید ) وەك زانینی شوێنی دەرچوونی پیتەکان و سیفەتەکان و مەرجەکانی درێژکردنەوە و حوکمەکانی نونی ساکن.

وەك: تێکهەڵکێشان، بەدیارخستن... لێرەدا حوکمی(فەرزی کفایة)یە لە سەر موسڵمانان.

## بەشی دووەم : تەجویدی کرداری (عملي):

بریتیە لە چۆنیەتی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بە دەربڕینێکی ڕاست و ڕەوان، وەك چۆن پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەری بڕیوە، ئەمەش (فەرزی عەینە) و پێویستە هەموو موسڵمانێك بە گوێرەی توانا خۆی لێ شارەزا بکات و پەیڕەوی لێ بکات، بە پێی ئەم بەڵگانەی خوارەوە :

أ - خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴾ المزمل: ٤.

واتە : دەوری قورئان بکەوە لە سەرخۆیی و بە ڕێك و پێکی.وەك چۆن هاوەڵەکان ڕەزای خوایان لێ بێت لە دەمی پیرۆزی پێغەمبەرەوە(ﷺ) وەریان گرتووە و بەو شێوازەی کە روون و ئاشکرایە و هەروەك چۆن پێغەمبەریش لە (جبریل)ـی وەرگرتووە ئەویش لە خوای گەورە وەری گرتووە بۆیە پێویستە ئێمەش هەر ئاوا وەریبگرین.

ب - خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۗ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴾ البقرة : ١٢١.

واتە: ئەوانەی کتێبمان پێبەخشیون (قورئان) بە چاکی دەوری دەکەنەوە لێی ورد دەبنەوەو بە (تێگەیشتن و کارپێکردن) ئا ئەوانە بڕوا دەهێنن بە ڕێنموونی خوا و ئەوانەی بێ بڕوا بن پێی هەر ئەوان زەرەر مەندن .

کەواتە بە پێچەوانەش ڕاستە کە یەکێك قورئانی پیرۆز بخوێنێتەوەو پەیڕەویی لە تایبەتمەندی و سیفەتی خوێندنەوەی نەکات لە کاتێکدا لە توانای دایە بە جوانی بیخوێنێتەوە ئەوا مافی تەواوی نەداوەو زەرەرمەند دەبێت.

ج- ناکرێ و نابی قورئانی پیرۆز بە ویست و ئارەزووی خۆمان بیخوێنینەوە وەك چۆن پەرتوك و گۆڤار و ڕۆژنامەکان دەخوێنینەوە، بەڵکو خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز تایبەتمەندی و سیفەتی خۆی هەیە بەم شێوەی کەپێغەمبەرمان(ﷺ) بۆمانی روون کردۆتەوە وە دەبێ موسڵمانانیش ئەوها بیخوێننەوە و دەری ببڕن و پارێزگاری لێ بکەن وەك چۆن بە سەر پێغەمبەر(ﷺ) دابەزیوە و خۆیان لە زار و دەمی مامۆستایانی شارەزا فێر بکەن

که ئەوانیش لە مامۆستا و شارەزای پێش خۆیان وەریانگرتووە.
بەڵام گەر یەکێك زمان یارمەتی نەداو و بە قورسی پیتەکانی بۆ دەهات یان کەسی دەست نەکەوت فێری بکات ئەوا خوای گەورە جگە لە توانای ئەو کەسە شتی قورستر لە سەر شانی دانانێت تەنانەت لە فەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ) هاتووە :
( کەسی زانا بە قورئانی پیرۆز لە گەڵ فریشتە پاك و بەرزەکانە، و ئەوەشی بە پچڕ پچڕی و قورسی دەیخوێنێتەوە و لە سەریشی قورسە ئەوا دوو پاداشتی هەیە ) ئیمام مسلم ئەم فەرمودەیەی گێڕاوەتەوە.
کەواتە ئەوەی هەوڵی دا قورئانی پیرۆز بە (تجوید) بخوێنێتەوە هێز و توانای خۆشی بە کار هێنا بۆ فێربوون و ڕەوان کردنی ئەوا دوو پاداشتی هەیە، ئەم فەرمودەیە ئاماژەیە بە چاك و باشی فێربوونی قورئانی پیرۆز و فێربوونی (تجوید) کە دەبێ مرۆڤ گرنگی بدات بە فێربوونی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز تا شارەزا دەبێت و بە چاك و روونی دەیخوێنێتەوە، وەك چۆن دابەزیووە، ئەو کات ناوی لە گەڵ فریشتە پاك و بەرزەکان دەبێت، لە خوای گەورە داواکارین لەو کەسانە بین.

**دەیەم** : چەند بابەتێك (مَسَائِلٌ) : کە مەبەستیشمان (حکم) و بنەما گشتیەکانە بۆ نموونە هەر کاتێك نونی ( ساکن ) یان تەنوین لە پێش پیتەکانی (إدغام) بێت ئەوا (إدغام) دروست دەبێت.
ئەم دە بنەمایە کە باسمان کرد زانایان لە پێشەکی نووسینەکانیان لە هەموو پەرتوکەکانی زانستی (تجوید) بەمە دەست پێدەکەن.

# شێوازەکانی دەست پێ کردنی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز

| | |
|---|---|
| الاستعاذة | أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ |
| البسملة | بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ |
| السورة | سەرەتای سورەت |
| الحكم | حوکمەکەی |

١- پچڕاندنی هەموویان لە یەکتری بەم شێوەیە:

﴿أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ وەستان ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ وەستان

﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢﴾.

قورئان خوێنان زیاتر بەم شێوەیە دەست پێدەکەن.

٢- پچڕاندنی یەکەم لە دووەم و گەیاندنی دووەم بە سێیەم، بەم شێوەیە:

﴿أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ وەستان

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ← گەیاندن ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢﴾.

تێبینی: بەڕەچاوکردنی هەمزەی گەیاندن کە ناخوێندرێتەوە لەکاتی گەیاندندا.

٣- گەیاندنی یەکەم بە دووەم و پچڕاندنی دووەم لە سێیەم، بەم شێوەیە:

﴿أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ گەیاندن ← وەستان

﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ٢﴾.

٤- گەیاندنی هەموویان بە یەکتری، بەم شێوەیە :

﴿أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ گەیاندن ← بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ گەیاندن ← ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ٢﴾.

بۆ قورئان خوێن دروستە بە هەر (چوار) شێوازەکە بخوێنێ.

تێبینی/_قورئان خوێن لە هەر شوێنێکی قورئان دەست پێ بکات پێویستە وریا بێت نابێت وشەی ﴿ٱلرَّجِيمِ﴾ بگەیەنێ بە وشەی ﴿ٱللَّهِ﴾ بەڵکو وشەی ﴿ٱلرَّجِيمِ﴾ دەپچڕێنی بە هەناسە لە نێوانیان ئینجا دەست پێدەکات بە وشەی ﴿ٱللَّهِ﴾.

**بۆ نموونە:**

﴿أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ وەستان بە هەناسە پاشان ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَيُّ ٱلْقَيُّومُ﴾ وەهەروەها بە هەمان شێوە ناوی خوا تێکەڵ نەکات لە گەڵ ناوی ﴿ٱلشَّيْطَٰنُ﴾.

**بۆ نموونە:**

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ وەستان بە هەناسە پاشان ﴿ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ﴾ البقرە: ٢٦٨.

## ڕاهێنان (١)

### خوێندنەوەی سورەتی ( الفاتحة) بۆ هەڵهێنجانی حوکمەکان:

أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿١﴾

ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾

ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣﴾ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴿٤﴾ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ

وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ﴿٥﴾ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴿٦﴾

صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ

عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧﴾

# شێوازەکانی خوێندنەوەی
# بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ لە نێوان دوو سورەتدا

- کۆتایی سورەتی یەکەم
- بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
- سەرەتای سورەتی دووەم

١. پچڕانی هەموویان لە گەڵ یەکتری بەم شێوەیە:

﴿ وَأَمَّا بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثۡ ﴿١١﴾ ﴾ وەستان ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ وەستان

﴿ أَلَمۡ نَشۡرَحۡ لَكَ صَدۡرَكَ ﴿١﴾ ﴾ ئەم شێوازە دروستە و قورئان خوێنان

زیاتر بەم شێوەیە دەیخوێنن.

٢. پچڕانی یەکەم لە دووەم، گەیاندنی دووەم بەسێیەم بەم شێوەیە:

﴿ وَأَمَّا بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثۡ ﴾ وەستان ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ← گەیاندن أَلَمۡ نَشۡرَحۡ

لَكَ صَدۡرَكَ ﴿١﴾ ﴾ ئەم شێوازەش دروستە.

٣. گەیاندنی هەموویان بە یەكتری بەم شێوەیە:

﴿وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ گەیاندن ⟵ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ گەیاندن ⟵ أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ① ﴾ ئەم شێوازەش دروستە.

ئەو جۆرەیان كە دروست نیە وەك :

گەیاندنی كۆتایی سورەت لەگەڵ ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ ئینجا بوەستی پاشان دەست بە سورەتەكەی تر بكەی، بەم شێوەیە :

﴿وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ گەیاندن ⟵ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ وەستان ئینجا ﴿أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ﴾

ئەم جۆرەیان قەدەغەیە ( دروست نیە ).

**تێبینی/** بۆیە ئەم جۆرەیان قەدەغەیە ( رێگەپێنەدراوە ).

- بەم شێوەیە لە پێغەمبەر(ﷺ) وەرنەگیراوە.
- ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بۆ سەرەتای سورەتەكەیە نەك كۆتایی.
- گوێبیست وا گومان دەبات كۆتایی سورەت ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ ە.

# شێوازەکانی گەیاندنی سورەتی (الانفال) بە (التوبة)

**الوقف** — **السكت** — **الوصل**

١. **(الوقف) :** واتە پچڕان لە یەکتری و وەستان لە کۆتایی سورەتی (الأنفال) بە هەناسە لە نێوان هەردوو سورەت، بەم شێوازە دەردەبردرێ:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ﴾ پچڕان بە هەناسە ﴿بَرَآءَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾.

٢. **السكت :** واتە لە کۆتایی سورەتی (الأنفال) دەنگ ببچڕێنی بە بێ هەناسەدان بە مەبەستی بەردەوام بوون لە خوێندنەوەی قورئان، بەم شێوازە دەردەبردرێ :

﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ﴾ (السكت) لەسەر وشەی ﴿عَلِيمٌ﴾ دەبێت پاشان خوێندنی ﴿بَرَآءَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾.

**تێبینی :**

ئەندازەی سەکت لە ( الوقف ) کەمترە.

**٣. الوصل:** واتە گەیاندنی کۆتایی سورەتی (الأنفال) بە سەرەتای سورەتی (التوبة) بەم شێوازە دەردەبردرێ:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ← گەیاندن بَرَآءَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾

## هۆی نەنوسین و نەخوێندنەوەی (بسملة) بە ناوی خوا لە سەرەتای سورەتی (التوبة):

- لە بەر نەبوونی ریوایەتێك لە پێغەمبەر(ﷺ) کە خوێندبێتیەوە، وە هەروەها لە بەر ئەوەی نوسەری (مصحف) نەینوسیوە، بۆیە لە خوێندنەوەش ناخوێنرێتەوە، وەلە هەموو سورەتەکانی تری قورئانی پیرۆز دەخوێندرێتەوە لە بەر ئەوەی بەڵگەی ڕاست و دروست هاتووە کە خوێندراوەتەوە.
- هەروەها (بسملة) ئایەتی ئاسایش و هێمنی و بەزەیی خوای گەورەیە، لەگەڵ ئەو هەڕەشە و سزایانەی کە لە سەرەتای سورەتەکەدا هەیە بۆ بێ باوەڕەکان ناگونجێت.

# شێوازەکانی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز




١. **التحقيق**: بریتیە لە خوێندنەوەی قورئان بە هێواشی و لە سەرخۆیی لەگەڵ تێڕامان و بیرکردنەوە لە واتاکانی و ئاگاداربوون لە حوکمەکانی (تجوید) وە هەر پیتێك مافی خۆی بدرێتی، ئەم شێوازە زیاتر بۆ فێرکردن بە کاردێت، بۆ نموونە شێوازە فێرکاریەکەی (شێخ محمود خلیل الحصري).

٢. **التدوير**: بریتیە لە خوێندنەوەیەکی مامناوەندی نە زۆر خێراو نە زۆر لەسەرخۆ لەگەڵ ئاگاداربوون لە حوکمەکانی (تجوید).

٣. **الحدر** : بریتیە لە خوێندنەوەی قورئان بە شێوەیەکی خێرا لەگەڵ ڕەچاوکردنی (حوکم) و مافەکانی (تجوید)، ئەم شێوازە زیاتر لە نوێژی (تراویح) یان لە کاتی دەورکردنەوە قورئان لەبەران دەیگرنەبەر.

**ڕوونکردنەوە : الترتیل**: گشتگیرە واتە هەرسێ شێوازەکە لەخۆ دەگرێت، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا﴾ دەربارەی ئەم ئایەتە زانایان دەفەرموون: (ترتیل) بریتیە لە جوان دەربڕینی پیتەکان و زانینی وەستان لە کاتی خوێندنەوەی قورئان.

## ڕاهێنان (٢)

**خوێندنەوەی چەند ئایەتێك لە سورەتی (النبأ)**
**بۆ هەڵهێنجانی شێوازەکانی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز[٣]:**

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ ﴿١﴾ عَنِ ٱلنَّبَإِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢﴾ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ مُخْتَلِفُونَ ﴿٣﴾
كَلَّا سَيَعْلَمُونَ ﴿٤﴾ ثُمَّ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ ﴿٥﴾ أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ مِهَٰدًا
﴿٦﴾ وَٱلْجِبَالَ أَوْتَادًا ﴿٧﴾ وَخَلَقْنَٰكُمْ أَزْوَٰجًا ﴿٨﴾ وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ
سُبَاتًا ﴿٩﴾ وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِبَاسًا ﴿١٠﴾ وَجَعَلْنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشًا ﴿١١﴾
وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا ﴿١٢﴾ وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا ﴿١٣﴾
وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلْمُعْصِرَٰتِ مَآءً ثَجَّاجًا ﴿١٤﴾ لِّنُخْرِجَ بِهِۦ حَبًّا وَنَبَاتًا ﴿١٥﴾
وَجَنَّٰتٍ أَلْفَافًا ﴿١٦﴾

---

٣) شێوازەکان بریتیە لە (التحقيق ، التدوير ، الحدر).

# هەڵەکردن لەقورئان خوێندندا (اللحن)

**اللحـــن:** لەزمانەوانیدا: لادان لە ڕاست و دروستی.

لەزاراوەدا: هەڵە کردن لە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز.

**هەڵـە کردن دەبێت بە دوو بەش**

(١) هەڵەی ئاشکرا

(٢) هەڵەی شاراوە

١. **هەڵـەی ئاشکرا:** بریتیە لە هەڵەکردن لە خوێندنەوەی پێکهاتەی قورئان ئینجا جیاوازی نی یە مانای وشەکە بگۆڕێ یان نەگۆڕێ، وەکو: گۆڕینی پیتێك بە پیتێکی تر یاخود گۆڕینی جووڵە (حرکة) بە جووڵە (حرکة) یەکی تر نموونـە:

أ) ( کسرة ) بکات بە ( فتحة ) نموونە:

﴿مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ﴾ . . . (من الجنَّةِ والنَّاس).

ب) ( فتحة ) بکات بە ( کسرة ) نموونە:

﴿أُوْلَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ﴾ . . . ( أُولئك أصحاب الجِنَّة).

ج) ( ضمة) بکات بە ( کسرة ) نموونە:

﴿وَرَسُولُهُۥ﴾ . . . (ورَسُولِه).

د) گۆڕینی پیتێك بە پیتێکی ترنموونە: ﴿يَنْحِتُونَ﴾ . . . (يَنـعِـتونَ).

ئەم جۆرە هەڵانە زانایان بەکۆی گشتی دەفەرموون حەرامە.

**تێبینی:**

بۆیە پێی دەوترێت هەڵەی ئاشکرا چونکە هەڵەکە ئاشکرایە لای کەسی شارەزاو نە شارەزا لە بواری (تجوید).

٢. **هەڵەی شاراوە:** بریتیە لە پابەند نەبوون بە مافەکانی (تجوید) بۆ نموونە بە قەڵەو نەخوێندنەوەی پیتی (غین) پێنەدانی (غنة) ی تەواو یان (مدّ) نەکردن، ئەم جۆرەیان قورئان خوێندن تێك دەدات بەڵام مانا تێك نادات وە بەم شێوازە وەرنەگیراوە لە پێغەمبەر(ﷺ)، زانایان دەربارەی ئەم جۆرە هەڵەیە دەفەرموون : (هەرکەسێك توانای فێربوونی هەبێ و هەوڵ نەدا فێر بێ گوناهبار دەبێ)، بەشێکیش دەفەرموون (مکروه)ـە چونکە کرۆك و ڕەونەقی جوان خوێندنەوە ناهێڵێت، بەڵام ئەگەر کەسێك زۆر هەوڵی بۆ دەداو نەی دەتوانی فێری بێ ئەوا گوناهبار نیە.

**تێبینی:**

هەڵەی شاراوە تەنها لای ئەوانە روونە کە شارەزان لە حوکمەکانی (تجوید).

**وریابە:** فێرخوازی بەڕێز خۆت بپارێزە لە هەردوو جۆری هەڵەکە، تا پاداشتی تەواو لای خوای گەورە وەربگری.

# ڕای زانایان دەربارەی ژمارەی دەرچەی پیتەکان

**زانایان سێ ڕایان هەیە لەسەر ژمارەی دەرچەی پیتەکان:**

**ڕای یەکـــەم:** ڕای (خلیل بن أحمد الفراهیدي و ابن الجزري ) و (ڕای زۆربـەی زانایـان ) ئەوەیـە کـە ژمـارەی دەرچـەی پیتـەکان حەڤدە دەرچەیە، بۆیە چەسـپاندویانە کە دەرچەی بۆشـایی (الجوف) و پیتەکانی (ا، و، ي) مەددی لە جێی خۆیەتی و بەم شـێوەیە دایان ناوە بەبێ دابەش کـردن، و بڕیاریـان داوە هـەر یـەك لە پیتەکانی ( لام ) و ( نون ) و ( راء ) دەرچەیەکی سەربەخۆیان هەیە، ئەمەش ڕای پەسەندە.

(ابن الجزري) ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ:

مَخارِجُ الحُرُوفِ سَبعَةَ عَشَرْ عَلى الَّذي يَختَارُهُ مَنِ اختَبَرْ

**ڕای دووەم :** ڕای (سَـــیبَوَیهِ و شاطبي) یە، لای ئەوان ژمارەی دەرچەی پیتـەکان شـازدە دەرچەیە، چونکە ئەوان بۆشـایی (الجوف)یـان بە دەرچە لە قەڵەم نەداوە کە بۆشـایی (الجوف) دەرچەی سـێ پیتی درێژکردنەوەیە، بەڵکـو پیتەکانیـان دابەشـکردووە بەسـەر دەرچەکانـی قـوڕگ و زمـان و لێوەکاندا، دەرچەی (أَلِف)ـی درێژکراوەیان لەگەل (همزة) لەکۆتایی قوڕگدا ئەژمار کردووە، و دەرچەی (یاء)ـی درێژکراوەیان لەگەل دەرچەی (یاء)ـی نەرم (اللین)ـی حەرەکەداری ناوەڕاستی زمان ئەژمار کردووە، وە دەرچەی ( واو )ی درێژکراوەیان لەگەڵ دەرچەی ( واو )ی نەرم ( اللین )ی حەرەکەداری دوو لێوەکاندا ئەژمار کردووە.

**ڕای سێـــیەم:** ئـەوەش ڕای (فـرَّاء و جُرمي و قُطرب)ـە، کـە ژمارەی دەرچەکان لای ئەوان چواردە دەرچەیە، چونکە دەرچەی بۆشـایی (الجوف) یـان ئەژمـار نەکـردووە و پیتەکانیان دابەشـکردووە، وەك لە ڕای دووەمدا هاتوە، وە پیتەکانی (لام) و (نون) و (راء)یان کردووە بە یەك دەرچە، واتە: دەرچەکانـی زمانیـان کـردووە بە هەشـت دەرچە لە جیاتـی دە دەرچە و دەرچە گشتییەکانیشیان کردووە بە چوار لە جیاتی پێنج دەرچەی.

## جۆرەكانى دەرچە (مخرج):

### دوو جـۆر دەرچەمان هەیە:

### گشتى ( سەرەكى ) و تايبەت ( لاوەكى )

**أ ) دەرچەی گشتی:** بریتیە لەوەی یەك دەرچەی تایبەت یان زیاتری تێدایە، ئەوانیش پێنج دەرچەی گشتین:

١- بۆشایی (الجوف) ٢- قورگ (الحلق)

٣- زمـــان (اللسان) ٤- لێوەكان (الشفتان)

٥- بۆشایی لووت (الخیشوم).

**ب ) دەرچەی تایبەت:** ئەوەیە كە لە یەك دەرچە زیاتر نەبێت، وە یەك پیتی لێوە دەردەچێت یان زیاتر، بۆ نمونە دەرچەی قورگ كە دەرچەیەكی گشتییە، سێ دەرچەی تایبەتی لەخۆدەگرێت، هەر دەرچەیەكی تایبەت دوو پیت لەخۆ دەگرێت.

### روون كردنەوە :

رای پەســەند كــە (رای زۆربــەی زانایــان) ئەوەیــە كە ژمــارەی دەرچەكان حەڤــدە دەرچەیــە، بــەڵام ئەگەر بە ووردی ســەیر بكەین هیچ دوو پیتێك یــەك دەرچەیــان نیە، بەڵكو هــەر پیتێك دەرچەیەكی تایبــەت بەخۆیەوە هەیــە كــە لێــی دەردەچێت، بــەم پێیەش ژمــارەی دەرچەكان بیســت و نۆ دەرچەن واتە : بەقەدەر ژمارەی پیتەكان ئەمەش لەبەر زۆر نزیكی شوێنی دەرچونی پیتەكان لەیەكتر.

زانا (أبو القِسط) رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ:

وَالحَصْرُ تَقْرِيبٌ وَفِي الحَــقِيقَــةْ لِكُلِّ حَرْفٍ بُقْعَةٌ دَقِيقَةْ

إِذْ قَالَ جُمهُور الـــــوَرَى مَا نَصُّهُ لِكُلِّ حَرْفٍ بُقْعَةٌ تَخُصُّهُ

### تێبینی:

بۆ زانینی شوێنی دەرچوونی هەر پیتێك لە پیتەكانی زمانی عەرەبی ئەوە ڕاهێنان دەكەین لەسەر پیتەكان، پیتەكە (ساكن) یان (شەددەدار) دەكەین (همزة)یەكی پچڕاو لە پێشی دادەنێین و دەیخوێنینەوە، دەنگ لە كوێ كۆتایی هات ئەو شوێنە شوێنی دەرچوونی پیتەكەیە، نموونە: ( أبْ ، أبّ ، أكْ ، أكّ ، أقْ ، أقّ ، أنْ ، أنّ ، أطْ ، أطّ ) ئەمە جگە لە پیتەكانی (المد و للين)، بەڵام بۆ پیتەكانی (المد) بەم شێوەیە دەردەبڕین.

نموونە: ﴿ نُوحِيهَآ ﴾ هود: ٤٩.

وە نموونە بۆ پیتی (اللين) بەم شێوەیە دەبێت.

نموونە: ﴿ بِٱلْغَيْبِ ﴾ المائدة: ٩٤، ﴿ قَوْمٍ ﴾ الأنفال: ٥٣.

جا بۆ زانینی دەرچەو دەنگی پیتەكان پێویستە فێرخواز بە شێوەیەكی تەواو لە دەم وزاری مامۆستای شارەزا و لێزان وەریبگرێت و گوێبیستی بێت.

# خشتەی ریزبەندی دەربڕینی پیتەکان لە شوێنی دەرچوونیان

| دەرچەی گشتی | شوێنی دەرچوونی یەکەم: بۆشایی ( الجوف ) | | | شوێنی دەرچوونی دووەم: قورگ ( الحلق ) | | | | | | شوێنی دەرچوونی سێ یەم : زمان ( اللسان ) | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ژمارەی دەرچە | ١پیتی درێژکردنەوە | | | ٢ | | ٣ | | ٤ | | ٥ | ٦ | ٧ | | | ٨ |
| دەربڕینی پیت | ءَا | ءُو | ءِي | يَء | أه | أع | أح | أغ | أخ | أقْ | أكْ | أجْ | أشْ | أيْ | أضْ |

| دەرچەی گشتی | شوێنی دەرچوونی سێ یەم : زمان ( اللسان ) | | | | | | | | | | | | شوێنی دەرچوونی چوارەم : لێوەکان ( الشفتان ) | | | | شوێنی دەرچوونی پێنجەم:بۆشایی لووت (الخیشوم) |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ژمارەی دەرچە | ٩ | ١٠ | ١١ | ١٢ | | | ١٣ | | | ١٤ | | | ١٥ | ١٦ | | | ١٧ |
| دەربڕینی پیت | أَلْ | أَنْ | أَرْ | أَطْ | أَدْ | أَتْ | أَظْ | أَذْ | أَثْ | أَصْ | أَسْ | أَزْ | أَفْ | أَوْ | أَبْ | أَمْ | ئەم دەرچەیە شوێنی دەرچوونی مینگە(غنة) یە لە پیتی (ن — م) |

# دەرچەی پیتەکان و نازناویان بە یەکەوە

### الجَوف — بۆشایی
- ١:( ا، و، ي) درێژکراوە

### الحَلق — قورگ
- ٢: ( ء ، هـ ) خوارەوەی قورگ
- ٣: ( ع ، ح ) ناوەڕاستی قورگ
- ٤: ( غ ، خ ) سەرەوەی قورگ

### اللسان — زمان
- ٥:(ق)٦:(ك) پیتەکانی پشکە مەڵاشوو
- ٧:(ج،ش ،ي) پیتەکانی ناوەڕاستی زمان
- ٨:(ض) لێواری زمان لە گەڵ خرێنەکانی سەرەوە
- ٩:(ل)١٠: (ن) ١١:(ر) پیتەکانی زمان تیژی
- ١٢:(ط،د،ت) پیتەکانی پێشەوەی مەڵاشوو
- ١٣:(ص، ز،س) پیتەکانی باریکایی زمان
- ١٤:(ث،ذ،ظ) پیتەکانی نزیك پووك

### الشَّفَتَين — دوو لێوەکان
- ١٥:(ف) پیتی لێوەکان
- ١٦:(و،م،ب) پیتی لێوەکان

### الخَيشوم — لووت
- ١٧:(م،ن) پیتەکانی مینگە

**تێبینی:**

ئەگەر سەیری ئەم خشتەیە بکەین تەنها (زمان) دە شوێنی دەرچوونی پیتەکان لەخۆ دەگرێت لە کۆی (بیست ونۆ) پیتی زمانی عەرەبی(هەژدە) پیتی لێوە دەردەچێت. لەم (هەژدە) پیتە یانزەیان لەپێشەوەی زمان (طرف اللسان) دەردەچێت.

# دەرچە سەرەکیەکان لە پیتەکاتی زمانی عەرەبی




**تێبینی:**

لەم وێنەیە روون دەبێتەوە لە (پێنج) شوێنی سەرەکی پیتەکانی زمانی عەرەبی دەردەچێت.

# یەکەم: بەشەکانی قورگ




**تێبینی:**

پێویستە فێرخواز ئەم شوێنانە بە چاکی بزانێت بۆ ئەوەی بەرچاوی روون بێت لە شوێنی دەرچوونی پیتەکان.

# دووەم: مەڵاشووی سەرەوە



## سێ یەم: بەشەکانی زمـان




## چوارەم: ددانـەکان



| | |
|---|---|
| دووانــە | (٤) |
| چوارینـە | (٤) |
| کەلبــە | (٤) |
| زەردەخەنە (پێکـەنـیـن ) | (٤) |
| هــارەڕ | (١٢) |
| خــڕێنە | (٤) |

**تێبینی/**

کۆی گشتی ددانەکان (٣٢) ددانە بەڵام چوار ددانەکانی خڕێنە (ژیری) هیچ دەورێکی نییە لەرووی دەربڕینی پیتەکان.

# پێناسەی پیت

## پیت :

بریتیە لەو دەنگەی کە پشت دەبەستێت بە شوێنی دەرچوونی دیاری کراو و دیاری نەکراو.

### بەشی دیاری کراوی دەرچەکە:

١ . (المخرج المحقق) دەرچەی دیاریکراو: بریتیە لە دیاری کردنی شوێنی دەرچوونی پیتەکە کە پشت دەبەستێت بە شوێنێکی دیاری کراو لە بەشەکانی ( قورِگ و زمان و هەردوو لێوەکان ).



پیتی (دال)

### بەشی نادیاری کراو لە بۆشایی قورِگ و دەم:

٢ . (المخرج المقدَّر) دەرچەی دیاری نەکراو: بریتیە لە دیاری نەکردنی شوێنی دەرچوونی پیتەکانی (المد) درێژکردنەوە کە پشت نابەستێت بە شوێنێکی دیاری کراو، لەو هەوایە پێك هاتووە کە لە هەردوو (بۆشایی قورِگ و دەم ) تێدەپەڕێت.



پتی (ألف)ی درێژ کراو

# چۆنیەتی ڕوودانی پیتەکان بە ئامرازی دەنگی[٤] مرۆڤ



**یەکەم / پیتی زەنەدار (ساکن) :**

دەردەچێت بە یەك کەوتنی دوو ئەندامی دەربڕین.

**بۆ نموونە :**

میمی زەنەدار (ساکن) بە لێکدانی دوو لێوەکان.



**دووەم / پیتی بزواو (متحرك) :**

دەردەچێت بە دوور کەوتنەوەی نێوان دوو ئەندامی دەربڕیندا لە گەڵ دەرچوونی بنچینەی جووڵەی پیتەکە : ( مَ ، مُ ، مِ ).

**بۆ نموونە :**

میمی (فتحة) دەردەچێت بە هۆی دوورکەوتنەوەی هەردوو لێوی مرۆڤ.

---

٤) دەنگ : بریتیە لە هەژان و لەرینەوەی چینەکانی هەوا بە شێوەیەك کە گوێچکەکانی مرۆڤ هەستی پێبکات .

## سێ یەم / پیتەکانی درێژکردنەوە ( المدّ ):

دەردەچێـت بە هەژان (لەرینەوە)ــی ژێیە دەنگی یـەکان لە (قورگ) لەگەڵ ئەوەش دەبێتە هۆی کردنەوەی دەم لە پیتی (ألف)، وە دەبێت زمان لە باری ئاساییدا بێت.

(ابن الجزري) رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ:

لِلْجَوفِ: أَلِفٌ و أُخْتَاهَا ، وَهِي حُرُوفُ مَدٍّ لِلْهَوَاءِ تَنْتَهِي



ژێیەکانی دەنگ

(ألف)ی درێژکردنەوە

بۆ نموونە :

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَـٰٓئِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ التحريم: ٦.

له پیتی (واو)ـی درێژکردنەوە بە خـــڕ بوونی دوو لێوەکان بۆ پێشەوە لە گەڵ بەرزبوونەوەی ئەو پەڕی زمان، بەبێ دروست بوونی تەنگی لە قورگ.




(واو)ی درێژکردنەوە

نموونە:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَعْتَذِرُوا۟ ٱلْيَوْمَ ۖ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ التحريم: ٧.

له پیتی (یـاء)ی درێژکردنەوە چەناگەی خوارەوە دادەبەزێت لە گەڵ بەرز بوونەوەی ناوەڕاستی زمان لە پیتی (یـاء).




(یاء)ی درێژکردنەوە

نموونە: ﴿ وَقِيلَ ٱدْخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ ﴾ التحريم: ١٠.

# بەشی یەکەمی سەرەکی دەرچەکان
# بۆشایی (الجوف)

(الجوف) لە زمانەوانیدا : واتە بۆشایی .

لە زاراوەدا : بریتیە لە : بۆشایی (قورگ) + بۆشایی (دەم و زار).



(ابن الجزري) رەحمەتی خوای لێ بێت بە یازدە بەیت هۆنراوە ئاماژە بە شوێنی دەرچوونی پیتەکان دەکات:

مَخَارِجُ الحُرُوفِ سَبْعَةَ عَشَرْ — عَلَى الَّذِي يَخْتَارُهُ مَنِ اخْتَبَرْ
لِلْجَوفِ: أَلِفٌ و أُخْتَاهَا ، وَهِي — حُرُوفُ مَدٍّ لِلْهَوَاءِ تَنْتَهِي
ثُمَّ لأَقْصَى الحَلْقِ : هَمْزٌ هَاءُ — وَ مِنْ وسَطِهِ : فَعَيْنٌ حاءُ
أَدْنَاهُ : غَيْنٌ خَاؤُهَا ، وَالْقَافُ — أَقْصى اللِّسانِ فَوْقُ، ثُمَّ الْكَافُ
أَسْفَلُ، وَالْوَسْطُ: فَجِيمُ الشِّنُ يَا — وَالضَّادُ: مِنْ حَافَتِهِ إِذْ وَلِيَا
لَاضْرَاسَ مِنْ أَيسَرَ أَوْ يُمْنَاهَا — وَاللَّامُ : أَدنَاهَا لِمُنْتَهَاهَا
وَالنُّونُ: مِنْ طَرَفِهِ تَحْتُ اجْعَلُوا — وَالرَّا: يُدَانِيهِ لِظَهْرٍ أدخَلُ
وَالطَّاءُ وَالدَّالُ وَتَا : مِنهُ وَمِنْ — عُلْيَا الثَّنايَا، والصَّفِيْرُ: مُسْتَكِنْ
مِنْهُ وَمِنْ فَوْقِ الثَّنايَا السُّفْلَى — وَالظَّاءُ وَالذَّالُ وَثَا: لِلْعُلْيَا
مِن طَرَفَيْهِمَا ، وَمِنْ بَطْنِ الشَّفَهْ: — فَالْفَا مَعَ اطرافِ الثَّنايَا الْمُشْرِفَهْ
لِلشَّفَتَيْنِ : الْوَاوُ بَاءٌ مِيمُ — وَغُنَّةٌ : مَخْرَجُهَا الخَيْشُومُ

# له بۆشایی قورگ و دەم سێ پیتی درێژکردنەوە دەردەچێت



(ألف)ی مەددی



(واو)ی مەددی



(یاء)ی مەددی

**تێبینی/**

راهێنان بۆ پیتەکانی درێژکردنەوە بە شێوەیەك لووتمان دەگرین بۆ زانینی دەنگی پیتەکانی (المد) کە نابێت لە لووتەوە دەربچێت کە رێگە پێنەدراوە بەڵکو دەبێت لە دەمەوە دەربچێت کە ئەمە دروستە.

## ئەم سێ پیتە (ا، و، ي) بە چەند ناوێک ناسراون :

١- پیتەکانی (المدّ) درێژکردنەوە.

٢- پیتەکانی (الجوف) بۆشایی.

٣- پیتەکانی (العلة) بزوێن.



کۆتایی هاتنی دەنگ لە هەوادا (ألف)ی مەددی.

کۆتایی هاتنی دەنگ لە هەوادا (یاء)ی مەددی.

کۆتایی هاتنی دەنگ لە هەوادا (واو)ی مەددی.

٤- پیتەکانی (الهوائیة) کۆتایی هاتنی دەنگە لە هەوادا، هەروەك لەم وێنانەدا دەردەکەوێت.

٥- پیتەکانی (الخفاء) شاراوەی دەنگ.

## ڕوونکردنەوە:

بە مەرج گیراوە بۆ ئەم سێ پیتە (ـَا ، ـُو ، ـِي) خۆیان (ساکن) بن ، و(حرکـة) لـە ڕەگەزی خۆیـان لە پێشـیانەوە هاتبێت.

أ- ئەلفی ساکن (ا)[٥] (فتحة)ی لەپێش هاتبێت.

نموونە : ﴿قَالَ﴾.

ب- واوی ساکن (و) (ضمة)ی لەپێش هاتبێت.

نموونە : ﴿يَقُولُ﴾.

ج- یائی ساکن (ی) (کسرة)ی لەپێش هاتبێت .

نموونە : ﴿قِيلَ﴾.

---

٥) پیتی (أَلِف) هەمیشە (ساکن)ـە و (فتحة)ـی لەپێش هاتووە، لە هیچ کاتێك لە سەرەتایی وشە نایێت، بەڵکو لە ناوەڕاستی وشە یان لە کۆتایی دێت،

نموونە: ﴿وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا﴾ الأحزاب: ٣٧.

# چەند تێبینی یەک دەربارەی پیتەکانی
## (الجوف ـ المدّ)

١- پێویستە لە دەربڕینی ئەم سێ پیتە (ا ـ و ـ ي) لە بۆشایی قوڕگ و دەمەوە دەربچێت و تێکەڵ نەبێت بە مینگە بەهۆی هاتنی لە نێوان دوو پیتی مینگە واتە لە بۆشایی لوتەوە دەرنەچێت بە هیچ شێوەیەك.

نموونە :

﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ﴾ الرحمن: ١، ﴿ٱلنَّاسِ﴾ الناس: ١، ﴿يُؤۡمِنُونَ﴾ غافر: ٥٩،
﴿مَمۡنُونٍ﴾ فصلت: ٨، ﴿مُّؤۡمِنِينَ﴾ الشعراء: ١٩٠، ﴿ظَٰلِمِينَ﴾ الأنباء: ٤٦.

٢- دەرچەی پیتەکانی (المدّ) پشت بە شوێنێکی دیاری کراو نابەستێت بۆیە لە سەر قورئان خوێن پێویستە خۆی بپارێزێت لە دەربڕینی پیتی (ألِف) نەیکات بە (همزة) لە کاتی وەستان لە سەر کۆتایی وشە.

نموونە : ﴿مِهَٰدًا﴾ النبأ: ٦، خوێندنەوەی هەڵە ﴿مِهادَءْ﴾ .

یان گۆڕینی (ألِف) بە (هاء).

نموونە : ﴿مهادَه﴾.

- ئەگەر فێرخواز بەم شێوازە هەڵەیە بخوێنێتەوە، واتە شوێنی دەرچەی بۆ پیتی (ألف) دیاری کردووە، ئەوەش لە خودی خۆیدا هەڵەیە و شوێنی دەرچوونی پیتی (ألف) دیاریکراو نیە.

٣- هەندێ لە جۆرەکانی خوێندنی قورئان هەن کە ڕێگە پێ نەدراون (غیر جائز) کە تیایاندا پیتەکانی (المدّ) دەبن بە چەند پیتێك لە ڕەگەزی خۆی ئەمەش لەئەنجامی لەراندنەوەی دەنگ بۆ پێدانی ئاواز.

نموونە :

﴿ٱلسَّمَآءُ﴾ النازعات: ٢٧ ، ﴿كَلَّا سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ﴾ التكاثر ٣ ،

﴿لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ﴾ الكافرون: ٦.

- خوێندنەوەی نەشاز لە پیتی (ألِف) نموونە: (السمـــااء).
- خوێندنەوەی نەشاز لە پیتی (واو) نموونە: (تعلمووون).
- خوێندنەوەی نەشاز لە پیتی (یـاء) نموونە: (دیـــییـــن).

٤- پێویستــە بۆ دەربرینی پیتی ( واو ) دوولێوەکان بەئەندازەی پێویست بۆ پێشەوە لوول بکرێن.

# بەشی دووەمی سەرەکی دەرچەکان
# قـورِگ ( الحلق )

## قـورِگ :

قورِگ شەش پیتی هەیە بە سەر سێ کۆمەڵە دابەش دەبن :

یەکەم / کـــۆتـایی قورِگ (ء ، ھ).
دووەم / ناوەڕاستی قورِگ (ع ، ح).
سێ یەم / سەرەتای قورِگ (غ ، خ).




## تێبینی/

پیتەکانــی قــورِگ لای راســتی وێنەکە سـیفەتی (الجهر)یـان هەیە، لای چەپیش سیفەتی (الهمس) یان هەیە و بەم سیفەتانە لێك جیا دەکرێنەوە.

بۆ نموونە:

لە پیتی (غین) و (خاء).

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| غين | الجهر | الرخاوة | الإستعلاء | الإنفتاح | الإصمات |
| خاء | الهمس | الرخاوة | الإستعلاء | الإنفتاح | الإصمات |

## یەکەم / کۆتایی قوڕگ

کۆتایی قوڕگ: ناوچەی دەنگە ژێیەکان پیتی (همزة) و (هـــاء)ی لێ دەردەچێت.



(إبن الجزري) ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەفەرموێ :

............ ثُمَّ لأقْصَى الحَلْقِ: هَمْزٌ هَاءُ

پیتی (هـاء) بە کردنەوەی بەشێکی دوو ژێیەکانی دەنگ دەردەچێت



هەمزەی زەنەدار (ساکن) بە گرتنی دوو ژێیەکان.

هەمزەی بزواو (متحرك) بە دوورخستنەوەی دوو ژێیەکان.

( هـــاء ) بە کردنەوەی بەشێکی دوو ژێیەکان.

﴿يَأْتِكُمْ﴾ التغابن: ٥، ﴿أَبَدًا﴾ التغابن: ٩، ﴿أَهْلِهِۦ﴾ الانشقاق: ١٣.

# جیاوازی نێوان (الهمزة) و (ألِف)

## الهمزة

دەرچەکەی دیاریکراوە
واتە : ( المحقق )ـە

جووڵە (حرکة) وەردەگرێت

لە سەرەتای وشە دێت.

لە هەموو کاتەکان بە ناسکی
( المرقق ) دەخوێندرێتەوە

## ألـف

دەرچەکەی دیاریکراو نیە
واتە : ( المقدَّر )ـە.

هەردەم (ساکن)ـە جووڵە
(حرکة) وەرناگرێت.

لە سەرەتای وشە نایێت.

لە هەندێک کاتدا بە قەڵەوی
( المفخم )دەخوێندرێتەوە.

# چەند تێبینی یەک لە سەر پیتەکانی (همزة – هاء):

١- نابێت پیتی (همزة) بە قەڵەوی بخوێندرێتەوە بە تایبەتی لەم وشانە: ﴿ٱلْحَمْدُ﴾ الفاتحة:٢، ﴿أَعُوذُ﴾ مريم: ١٨، ﴿ٱهْدِنَا﴾ الفاتحة:٦، یان بە هەژان (قلقلة) بە تایبەتی لەم شوێنانەی کە (ساکن) بن.

نموونە: ﴿حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ﴾ البقرە: ٢٢١، ﴿يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمُونَ﴾ النساء: ١٠٤.

٢- نابێت پیتی ( هــاء ) بە قەڵەوی بخوێندرێتەوە بە تایبەتی لە کاتی خوێندنەوەی وشەی ﴿ٱللَّهَ﴾ بە هۆی (لام لفظ الجلالة) کە بە قەڵەوی دەخوێندرێتەوە.

٣- بە دیار خستنی دەرچەی (هـاء) زۆر بە جوانی لە کاتی بە یەك گەیشتنی دوو (هـاء)ی بزواو (متحرك)

وەك: ﴿وَيُلْهِهِمُ﴾ الحجر٣، ﴿جِبَاهُهُمْ﴾ التوبة ٣٥، ﴿وُجُوهُهُمْ﴾ آل عمران١٠٦.

٤- بە دیار خستنی دەرچەی پیتی (همزة) بە جوانی لە کاتی بە یەك گەیشتنی دوو(همزة)ی بزواو (متحرك)

وەك: ﴿جَآءَ أَحَدٌ﴾ النساء: ٤٣، ﴿أَهَٰٓؤُلَآءِ إِيَّاكُمْ﴾ سبأ: ٤٠.

٥- نەشاردنەوەی دەرچەی (هـاء) لە کاتی وەستان لە سەری

وەك: ﴿فَأَهْلَكْتَهُۥ﴾ آل عمران: ١١٧.

٦- نابێت پیتی (هـاء) تێکەڵ بکەین بە پیتی (ألف) بەهۆی هاتنی (فتحة) لە پێشی، بە تایبەتی لە کاتی وەستان .

نموونە: ﴿ٱلْقَارِعَةُ﴾ القارعة: ١.

٧- بایەخ دان بە سیفەتی (الجهر) لە پیتی (همزة) بە گرتنەوەی هەوای هەناسە.

٨- بایەخ دان بە سیفەتی ( الهمس ) لە پیتی (هـــاء) بە رۆیشتنی هەوای هەناسە لەدەرچەکەی، ئەگەر سەیری سیفەتەکانی پیتی (هـــاء) بکەین لاوازتریـن پیتە لە زمانی عەرەبی، گەرچی زۆرترین هەوای هەناسـەی پێویسـتە بەپێچەوانـەی پیتـی (طـاء) کـە بەهێزترین پیتـە و هەوای هەناسە لەگەڵی دەرناچێ .

نموونە :

﴿ طــه ﴾ طه:١

(بەهێزترین پیتە) — (لاوازترین پیتە)

## دووەم / ناوەڕاستی قوڕگ

ناوەڕاستی قوڕگ: ناوچەی زمانە بچکۆڵە لە گەڵ دیواری دواوەی قوڕگ پیتی (عیـن و حــاء) لێی دەردەچێت.
(ابن الجزري) رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ:

.................. وَ مِـنْ وسَطِـهِ : فَعَيْنٌ حاءُ




بایەخ دان بە سیفەتی (الجهر) لە پیتی (عین) بە گرتنەوەی هەوای هەناسە.




بایەخ دان بە سیفەتی (الهمس) لە پیتی (حاء) بە ڕۆیشتنی هەوای هەناسە.

# چەند تێبینی یەک لە پیتەکانی

## (عین - حاء) :

١- بە دیار خستنی دەرچەی (عین) بە رێکی لە کاتی بە یەك گەیشتنی دوو پیتی (عین)ی بزواو (متحرك)

وەك : ﴿أَن تَقَعَ عَلَى ٱلْأَرْضِ﴾ الحج: ٦٥، ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ﴾ سبأ: ٢٣.

٢- سیفەتی هەژان (قلقلة) نەدەین بە پیتی (عین) یاخود بە نیو (عین) دەری نەخەین بە تایبەتی ئەگەر (ساكن) بێت.

وەك : ﴿تَعْلَمُونَ﴾ البقره ٢٢، ﴿لَا تَعْتَذِرُوا۟﴾ التحريم: ٧، ﴿هَٰذَا ٱلْوَعْدُ﴾ الملك: ٢٥.

٣- دەبێت وریا بین پیتی (حاء) و (عین) تێکەڵ نەکرێن بە هۆی دەرچوونیان لە یەك شوێن.

وەك : ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾ البقرة ١٥٨، ﴿زُحْزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ﴾ ل عمران: ١٨٥، ﴿ٱلْمَسِيحُ عِيسَى﴾ آل عمران: ٤٥.

## سێ یەم/ سەرەتای قوڕگ

**سەرەتـای قـوڕگ** : ناوچەی رەگی زمان لەگەڵ مەڵاشووی نەرم پشکە مەڵاشوو پیتی (غین و خاء) لێی دەردەچێت.

(ابن الجزري) رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ:

أَدْنَاهُ : غَيْنٌ خَاؤُهَا..................




بایـەخ دان بە سیفەتی (الجهر) لە پیتی (غیـن) بـە گرتنـەوەی هـەوای هەناسـە، کـە لـە هەموو سیفەتەکان لەگـەڵ پیتی (خـاء) وەك یەکـن تەنهـا بـە سیفەتی (الجهر) لێك جیا دەکرێنەوە.

نموونەی پیتی (غین) :

﴿رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا﴾ الحشر: ١٠.




بایەخ دان بە سیفەتی (الهمس) لە پیتی (خاء) بە رۆیشتنی هەوای هەناسە

نموونەی پیتی ( خاء ) :

﴿وَأَخْرَجُوكُم﴾ الممتحنة: ٩.

# ئەو هەڵانەی دەکرێن لە کاتی دەربڕینی پیتەکانی (قورگ) بە گشتی :

١- گۆڕینی پیتی (همزة) بە پیتی (هـاء).

نموونە : ﴿ءَأَنذَرْتَهُمْ﴾ البقرة : ٦.

٢- نابێت پیتی (همزة) بە بەرزی بخوێندرێتەوە یان بە هەژان (قلقلة).

نموونە : ﴿يُؤْمِنُونَ﴾ بە تایبەتی لەم شوێنانەی کە (ساکن) بن.

٣- گۆڕینی پیتی (حـاء) بە پیتی (هـاء).

نموونە : ﴿يَٰنُوحُ ٱهْبِطْ﴾ هود : ٤٨.

٤- گۆڕینی پیتی (عيـن) بـە (حـاء).

نموونە : ﴿عَلَيْكُمْ﴾ البقرة : ٢٣٣.

گۆڕینی پیتی (غین) بە پیتی (خـاء).

نموونە : ﴿وَٱسْتَغْفِرْهُ﴾ النصر: ٣.

٥- نابێت پیتی (غین) تێکەڵ بکەین یان نزیکی بکەینەوە لە پیتی (قاف) بە هۆی لێك نزیکی دەرچەیانەوە.

نموونە : ﴿رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا﴾ آل عمران: ٨،

بە تایبەتی لە وشەی ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ﴾ الفاتحة : ٧.

## تێبینی/

پێویستە فێرخواز ئاگاداری ئەو پیتانە بێت کە هاوشێوەن و بزواون و لە دوای یەکتریش هاتوون و شوێنی دەرچوونیان تێکەڵ بە یەکتر نەکات واتە هەردووکیان نەکات بە یەك پیت لە دەربڕین.

| سورەت | نموونـــە | پیت |
|---|---|---|
| البقرة ( ٣١ ) | ﴿ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴾ | ء |
| الحجر ( ٣ ) | ﴿ وَيُلۡهِهِمُ ٱلۡأَمَلُ ﴾ | هـ |
| الكهف ( ٩٠ ) | ﴿ وَجَدَهَا تَطۡلُعُ عَلَىٰ قَوۡمٍ ﴾ | ع |
| الكهف ( ٦٠ ) | ﴿ أَبۡرَحُ حَتَّىٰٓ ﴾ | ح |
| آل عمران ( ٨٥ ) | ﴿ وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ ﴾ | غ |

# بەشی سێیەمی سەرەکی دەرچەکان
## دەرچەی پیتەکانی زمان

### یەکەم/ دەرچەی پیتی قـاف

( ابن الجزري ) رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ:

وَالْقَافُ ..........................

أَقْصى اللِّسانِ فَوْقُ ثُمَّ الْكَافُ

أَسْفَلُ..........................




کۆتایی زمـان لەگەڵ گۆشتە مەڵاشووی نـەرم،

نموونه : ﴿فَحَقَّ وَعِيدِ﴾ ق: ١٤.

### دووەم/ دەرچەی پیتی کـاف




لەژێر پیتی قاف و کۆتایی زمـان لەگەڵ گۆشتە مەڵاشووی نـەرم و ئێسکە مەڵاشوو،

نموونه : ﴿أَفِي اللَّهِ شَكٌّ﴾

إبراهيم: ١٠.

# چەند تێبینی یەک لە سەر پیتەکانی

## (قاف - کاف) :

١- وریا بین لە پیتی ( قاف ) ی کەسرەدار ( مكسور ) و تێکەڵی نەکەین بە ( کـاف ).

نموونە : ﴿ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ الفاتحة : ٦.

٢- پێویستە جیاوازی بکەین لەنێوان پیتی قافی شەددە دارو بێ شەددە لەکاتی وەستان لەسەری .

نموونە : ﴿وَبَرۡقٌ﴾ البقرة : ١٩، ﴿ٱلۡحَقِّ﴾ البقرة : ٦١.

٣- لە کاتی بەیەك گەیشتنی دوو(قـاف)ـی بـزواو (متحرك) پێویستە هەردووکیان (إظهار) بکەین،

نموونە : ﴿بِٱلۡحَقِّ قَالُوٓاْ﴾ الأنعام : ٣٠، ﴿حَقَّ قَدۡرِهِۦٓ﴾ الأنعام : ٩١.

٤- نابێت پیتی (کاف) بگۆڕین بە پیتی (گ)ی کوردی بە تایبەتی لەو شوێنانەی هەمزەی پچڕوای لە پێش بێت،

نموونە : ﴿وَٱلۡفِتۡنَةُ أَكۡبَرُ مِنَ ٱلۡقَتۡلِ﴾ البقره : ٢١٧.

٥- لە کاتی بە یەك گەیشتنی دوو پیتی( کاف )ـی بزواو(متحرك) پێویستە هەردووکیان (إظهار) بکەین،

نموونە : ﴿مَّنَٰسِكَكُمۡ﴾ البقره: ٢٠٠،

﴿إِنَّكِ كُنتِ﴾ یوسف: ٢٩، ﴿إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا﴾ الانشقاق: ٦.

## سێیەم/ دەرچەی پیتی جیم




ناوەڕاستی زمان لەگەڵ ناوەڕاستی مەڵاشووی سەروو بەریەك دەكەون.

نموونەی پیتی (جیم) :

﴿تَجۡرِی﴾ البروج: ١١.

( ابن الجزري ) رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ:

............ وَالْوَسْطُ: فَجِيمُ الشِّنُ يَا ...............

## سێیەم/ دەرچەی پیتی شیـن




ناوەڕاستی زمان لەگەڵ ناوەڕاستی مـەڵاشـوی سـەروو لـەگـەڵ بوونی بۆشایی كەم لە نێوانیاندا.

نموونەی پیتی (شین):

﴿وَٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾ البينة: ١.

# تێبینی لە سەر دەربڕینی پیتی (یاء) ی ناوەراستی زمان :

١- پێویستە شەددەی پیتی (یاء) ناوەراستی زمان لە کاتی ڕۆیشتن و وەستان لە سەری بە جوانی بە دیارکەوێت.

نموونە : ﴿رِبِّيُّونَ﴾ آل عمران: ١٤٦، ﴿إِنَّ وَلِـِّۧيَ ٱللَّهُ﴾ الأعراف: ١٩٦، ﴿ٱلسَّامِرِيُّ﴾ طه: ٨٧.

٢- لە کاتی بە یەك گەیشتنی دوو (یاء)ی بزواو (متحرك) پێویستە هەردووکیان (إظهار) بکرێن .

نموونە : ﴿فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ﴾ النحل: ٩٧، ﴿وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ﴾ الكهف: ٢٨.

٣- (یاء)ی (شەدەدار) پێویستیی بە دەنگ بەرزی هەیە (النبر) لە کاتی دەربڕیندا.

نموونە : ﴿وَهُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْعَظِيمُ﴾ البقرە: ٢٥٥.

٤- نابێت دەنگی مینگە (غنة) تێکەڵ بکرێت لە گەڵ پیتی (یاء) بە تایبەتی ئەگەر بکەوێتە تەنیشت (نون و میم).

نموونە : ﴿ٱلدُّنْيَا﴾ الجاثية : ٢٤، ﴿مَرْيَمَ﴾ الصف : ٦.

# بەراورد لە نێوان دەرچەی هەریەک لە پیتەکانی

## (جیـم) و (شیـن) و (یـاء - اللین)



### دەرچەی (جیـم)

ناوەڕاستی زمان لە گەڵ ناوەڕاستی مەڵاشووی سەروو بەریەك دەکەون .

نموونە: ﴿ نَّجۡعَلَ ﴾ الكهف : ٤٨.



### دەرچەی (شین)

ناوەڕاستی زمان نزیك دەبێتەوە لە ناوەڕاستی مەڵاشووی سەروو، بەڵام بەریەك ناکەون.

نموونە : ﴿ وَلَا يُشۡرِكُ ﴾ الكهف : ٢٦.



### دەرچەی (یـائی - اللین)

ناوەڕاستی زمان لە گەڵ ناوەڕاستی مەڵاشووی سەروو بەریەك ناکەون.

نموونە : ﴿ الۡبَيۡتِ ﴾ قريش: ٤.

# ئەو هەڵانەی دەكرێن لە شوێنی دەرچوونی پیتەكانی ناوەڕاستی زمان :

١- تێكـەڵ كردنـی پیتـی (جیم) بە پیتی (ژ)ـی كوردی هـەروەك خەڵكی لبنـان لـە لەهجەدا دەری دەبڕن، فێرخواز هەڵە دەكات بە تایبەتی لەم شوێنانە.

نموونە : ﴿خَبِيثَةٍ ٱجۡتُثَّتۡ﴾ إبراهيم:٢٦، ﴿ٱجۡتَبَىٰهُ﴾ النحل:١٢٢، ﴿ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ﴾ الإسراء:١.

٢- تێكـەڵ كردنـی پیتی (جیم) بە پیتـی (چ) و (ج) ی كوردی ئەمەش بە هۆی هێشتنەوەی بۆشایی لە نێوان مەڵاشووی سەروو لە گەڵ ناوەڕاستی زمان و بایەخ نەدان بە سیفەتی (الشدَّة ، الجهر) لە پیتی (جیم).

نموونە : ﴿لِيُحَآجُّوكُم﴾ البقره : ٧٦.

﴿وَجۡهِكَ﴾ البقره : ١٤٤.

# تێبینی لە دەربڕینی پیتی (شین)[٦]

٣- تێکەڵ کردنی پیتی (شین) بە (سین) بە تایبەتی ئەگەر پیتی (شین) کەسرەی لە ژێر بێت یان (ساکن) بێت، ئەوەش بە هۆی پێشخستنی زمانەوە لە ناوەراست بۆ لای پێشەوەی زمان لەو کات دەنگێك دەردەچێت نزيك پيتی(سين) ئەوەش ریگەی پێنەدراوە،

نموونە : ﴿ تَمۡشِي عَلَى ٱسۡتِحۡيَآءٖ ﴾ القصص: ٢٥.

﴿ كَرَمَادٍ ٱشۡتَدَّتۡ ﴾ إبراهيم : ١٨.

نابێت پیتی (شین) بە قەڵەو بخوێنینەوە بە هۆی هاتنی لە تەنیشت پیتی قەڵەو.

نموونە : ﴿ شَطَطًا ﴾ الجن : ٤.

---

٦) پیتی ( شین ) بە دوو سیفەتی بێ هاودژ لە پیتی ( سین ) جیا دەکرێتەوە :

- التفشي ( بڵاوبوونەوەی دەنگ ) : تەنها سیفەتی پیتی ( شین )ـە.
- الصفير ( فیکە ): تەنها سیفەتی پیتەکانی ( سین، صاد، زای )ـە.

## چوارەم/ دەرچەی پیتی ضــاد







( ابن الجزري ) ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەفەرموێ :

وَالضَّــادُ: مِنْ حَافَـتِهِ إِذْ وَلِيَا ...................

................... لاَضْرَاسَ مِنْ أَيسَرَ أَوْ يُمْنَاهَا

## ئەو شوێنەی زمان کە پیتی ضــاد دەیگرێتەوە









پێناسەی دەرچەی پیتی ( ضــاد ) : لە یەك لە دوو لێواری زمــان ( چەپ یان ڕاست یان هەردوو لا بە یەکەوە ) لەگەڵ بەرامبەرەکەیان لە ددانەکانی پێکەنین و هاڕەڕ و خرێنە ٠

# ئەو هەڵانەی دەکرێن لە شوێنی دەرچوونی پیتی (ضاد) :

١- گۆڕینی پیتی (ضاد) بە پیتی (لام)ێکی قەڵەو بە هۆی لە یەك نزیکی شوێنی دەرچوونیان.

نموونە: ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ الفاتحة : ٧.

٢- دووبارەبوونەوەی پیتی( ضاد ) لەناو یەك وشە پێویستە ئاشکرا بکرێت و تێکەڵ بەیەك نەکرێت.

نموونە: ﴿يَغۡضُضۡنَ﴾ النور : ٣١، ﴿وَٱغۡضُضۡ﴾ لقمان : ١٩.

٣- گۆڕینی پیتی (ضاد) بە پیتی ( دال )ێکی قەڵەو یان بە (زاي)ێکی قەڵەو.

نموونە : ﴿تُفِيضُونَ﴾ الأحقاف : ٨.

٤- تێکەڵ کردنی پیتی (ضاد) بە پیتی (طـاء) یان بە (تـــاء) بە تایبەتی

لەم نموونانە :﴿ثُمَّ أَضۡطَرُّهُۥٓ﴾ البقرە : ١٢٦، ﴿فَمَنِ ٱضۡطُرَّ﴾ البقرە : ١٧٣،

﴿فَإِذَآ أَفَضۡتُم﴾ البقرە : ١٧٣، ﴿وَقَدۡ فَرَضۡتُمۡ﴾ البقرە : ٢٣٧،

﴿وَخُضۡتُمۡ﴾ التوبة : ٦٩.

٥- تێکەڵ کردنی پیتی (ضاد) بە پیتی (ظاء) بە تایبەتی لەم شوێنانە:-

﴿بَعۡضَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ الأنعام : ١٢٨، ﴿يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ﴾ الفرقان : ٢٧،

﴿إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٌ﴾ الحجرات : ١٢، ﴿ٱلَّذِيٓ أَنقَضَ ظَهۡرَكَ﴾ الشرح : ٣.

لە قورئانی پیرۆز تەنها چوار شوێن پیتی (ضاد) پیتی (ظاء)ی بە دوادا هاتووە، بۆیە پێویستە فێرخواز راهێنان بە زمانی بکات بەم دوو پیتە.

# جیاوازی نێوان پیتی (ضاد) و (ظاء)

أ- جیاکردنەوەیان بە وێنەو شێوەیان لە نوسیندا،

ناوەراستی وشە، نموونە : ﴿يُضِلُّ﴾ البقره : ٢٦، ﴿أَنظِرْنِيٓ﴾ الأعراف : ١٤،

کۆتایی وشە، نموونە : ﴿ٱلْأَرْضُ﴾ المزمل : ١٤، ﴿مَّحْفُوظٍ﴾ البروج : ٢٢.

ب- جیاکردنەوەیـان بـە شـوێنی دەرچوونیـان : دەرچـەی (ضـاد) لێـواری زمـان لـە گـەڵ ( هـاڕەڕی سـەرەوە )، دەرچەی (ظاء) پێشـەوەی زمان (طرف اللسان) دەکەوێتـە ژێر دووانەی سـەرەوە. وەك ( ابن الجزري ) رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ:

وَالضَّاد باستطَالَةٍ وَمخْرجِ ميِّزْ مِن الظَّاءِ وَكلُّهَا تَجِيْ

ج- جیـاکردنەوەیـان بـە سیفـەتی (الإستطالـة) کە تەنها سیفـەتی پیـتی (ضـاد)ـە، ئەگـەر سەیری سیفەتەکانی تر بکەین وەك یەکن تەنها لەم سیفەتە نەبێت.

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ظاء | الجهر | الرخاوة | الإستعلاء | الإطباق | الإصمات | |
| ضاد | الجهر | الرخاوة | الإستعلاء | الإطباق | الإصمات | الإستطالة |

# پێنجەم/ دەرچەی پیتی لام






له نزیکترین بەشی دوو لێواری زمان تا کۆتایی نزیکترینی زمان لەگەڵ بەرامبەری خۆی لە مەڵاشوو سەروو (ابن الجزري) رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ:

وَالـلاَّمُ: أَدنَاهَا لِمُنْتَهَاهَا .............

## ئەو شوێنەی زمان کە پیتی لام دەیگرێتەوە






**ناوچەی لام:**
لە نزیکترین لێواری زمان تا کۆتایی لێوار لەگەڵ تەنیشتی مەڵاشووی سەرەوە

### تێبینی/

پیتی (لام) فراوانترین شوێنی دەرچوونی هەیە ، فێرخواز دەتوانێ یەك لا زمانی بەکاربێنێ، بەڵام وا باوە لای راست ئاسانترە لە دەربڕین بە پێچەوانەوەی پیتی (ضاد) کە لای چەپی ئاسانترە لە دەربڕین.

# بەراوردێک لە نێوان لامی قەڵەو و لامی لاواز ( ناسک )



لامی قـەڵەو:

- پیتـی (لام) تەنها لـە (لام)ـی (لفظ الجلالة _ الله) بـە قەڵـەوی دەخوێندرێتـەوە ئەگـەر (فتحة)یـان (ضمة)ی لە پێش هاتبێت.

نموونە:

﴿وَٱللَّهُ﴾ الأنفال:٢٩ ، ﴿عَبۡدُ ٱللَّهِ﴾ الجن : ١٩.

- لە گەڵ پیتی(لام )ی قەڵەو ناوەڕاستی زمان چاڵ دەبێت و تەنگیەك لە قوڕگ دروست دەبێت بە هۆی بەرزبوونەوەی کۆتایی زمان، بەڵام لە گەڵ پیتی (لام )ـی ناسك ناوەڕاستی زمان چاڵ نابێت و هیچ تەنگیەك لە قوڕگ دروست نابێت بە هۆی بەرزنە بوونەوەی کۆتایی زمان.

نموونە : ﴿أَنزَلۡنَآ﴾



لامی لاواز:

وێنەی دەربڕینی (لامی) لاواز.

## شەشەم/ دەرچەی پیتی نون

نـون:



(طرف اللسان) پێشەوەی زمان کەمێك بۆ سەر پشتی زمان لەگەڵ پوکی ددانەکانی (دووانـە) کەمێك لە ژێر دەرچەی (لام) لـەگـەڵ مینگە کـە لـە بۆشایی لووت (الخیشوم) دەردەچێ تەواوکەری یەکترن بەشی زمان تەواو کراوە، و بەشی بۆشایی لووت تەواوکەرە.

نموونە: ﴿ٱلْجَنَّةُ﴾ق : ٣١.

(ابن الجزري) رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ:

وَالنُّونُ : مِنْ طَرَفِهِ تَحْتُ اجْعَلُوا ......................

## حەوتەم/ دەرچەی پیتی راء

راء:



(طـرف اللسـان) پێشـەوەی زمـان کەمێـك بـۆ سەرپشـتی زمانەوە لەگـەڵ پوکەکانی سەرەوە نزیك دەرچەی پیتی نون.

نموونە: ﴿هُوَ ٱلْبَرُّ ٱلرَّحِيمُ﴾الطور: ٢٨.

( ابن الجزري ) رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ:

وَالرَّا : يُدَانِيهِ لِظَهْرٍأَدخَلُ ..............

## ئەو هەڵانەی دەکرێن لە پیتەکانی (لام) و (نون) و (راء)

١- بە قەڵەو خوێندنەوەی پیتی (لام)ی ناسك، بەهۆی هاتنی لە تەنیشت پیتی قەڵەو.

نموونە : ﴿وَلۡيَتَلَطَّفۡ﴾ الكهف : ١٩، ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ﴾ النحل : ٩،
﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ الفاتحة : ٧، ﴿سُلۡطَٰنٍ﴾ غافر : ٥٦.

٢- خوێندنەوەی پیتی (لام) بە هەژان (القلقلة) بە تایبەتی لەو شانەی (ساكن)ـن.

نموونە: ﴿وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ﴾ القمر : ١، ﴿عَلَّمَهُ ٱلۡبَيَانَ﴾ الرحمن : ٤ .

٣- تێکەڵ کردنی دەنگی (لام) بە مینگە (غنة) بە هۆی نزیکی دەرچەیان لە یەکتری و کۆبوونەوەیان لە یەك وشە.

نموونە : ﴿قُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ﴾ البقرة: ٣٨، ﴿وَجَعَلۡنَا ٱلَّيۡلَ﴾ النبأ : ١٠.

٤- خوێندنەوەی پیتی (نون)ـی (ساكن) بە هەژان (القلقلة)، بەهۆی پەلەکردنی زمان لە شوێنی دەرچوونی.

نموونە: ﴿مِنۡهُمۡ أَئِمَّةٗ﴾ السجدة: ٢٤، ﴿تُغۡنِيَ عَنۡهُمۡ﴾ المجادلة: ١٧،
﴿تُسۡقَىٰ مِنۡ عَيۡنٍ ءَانِيَةٖ﴾ الغاشية: ٥.

٥- خوێندنەوەی پیتی (نون)ـی (ساكن) بە قەڵەوی بە هۆی هاتنی لە تەنیشت پیتی قەڵەو.

نموونە: ﴿ٱلنَّخۡلِ﴾ طه : ٧١، ﴿نُقَٰتِلۡ﴾ البقرة : ٢٤٦،
بە تایبەتی لەو شوێنانەش: ﴿ٱلنَّٰصِرِينَ﴾ ال عمران : ١٥٠، ﴿ٱلنَّارِ﴾ المدثر : ٣١.

٦- لوول كردنى دوو لێوەكان بۆ پێشەوە لە كاتى دەربڕينى پيتى (راء) بە هۆى هاتنى (ضمة) لە پێشى.

نموونە : ﴿بُرۡهَـٰنَ﴾ يوسف : ٢٤، ﴿ٱلۡفُرۡقَانَ﴾ الفرقان : ١.

كە مەرجە لێوەكان لەبارى (ساكن) دابن لە (راء)ى (ساكن).

٧- زێدەڕۆيى كردن لە دووبارەكردنەوەى پيتى (راء) بە هۆى پێك كەوتنى زمان بە پوكو لە جارێك زياتر كە رێگەپێنەدراوە.

نموونە : ﴿تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ﴾ الحج : ٧٦، ﴿ءَامَنُواْ ٱرۡكَعُواْ﴾ الحج : ٧٧.

- ﴿ تُرْررجَعُ الأُمُورُ ﴾ بە هۆى پێككەوتنى زمان و پوك لە جارێك زياتر كە دەبێتە هۆى دروست بوونى چەند (راء)ێك.
- ﴿ ءَامَنُواْ ارْرركَعُواْ ﴾ بە هۆى پێككەوتنى زمان و پوك لە جارێك زياتر كە دەبێتە هۆى دروست بوونى چەند (راء)ێك.

٨- نابێت پيتى (راء)ـى (ساكن) تێكەڵ بكەين بە پيتى (لام)ـى بزواو (متحرك).

نموونە: ﴿فَٱغۡفِرۡ لَنَا﴾ الأعراف : ١٥٥، ﴿وَٱغۡفِرۡ لَنَا﴾ الممتحنة : ٥.

لە ريوايەتى(حفص) بە دەرخستنى تەواو -رەها- (الإظهار المطلق) ناسراوە.

# لاربوونەوەی دەنگی پیتی (راء)



لاربوونـەوەی دەنگـی پیتـی (راء) لە هەردوو لا تەنیشـتەکانی زمـان لادەدا بـۆ ناوەراسـتی پێشـەوەی زمـان ، لـەو بۆشـاییە کـە لێیـەوە دەردەچێت بەشـێکی دەنگ لە دەربڕینـی (راء) بە شێوازێك دەرچەکە داناخرێت بە تەواوی وەپارێزگاری دەکەین لـە دووبـارە نەبوونەوەیپیتی (راء) کـە رێ پێنەدراوە دووبارە ببێتەوە.

# بەراود لە نێوان رای قەڵەو و رای لاواز ( ناسک )



( راء )ی قەڵەو:

لەگەڵ پیتی (راء)ی قەڵەو ناوەڕاستی زمان چاڵ دەبێت، و تەنگیەك لە (قوڕگ) دروست دەبێت، بە هۆی بەرزبوونەوەی کۆتایی زمان.

**نموونە:** ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ﴾ یس: ١٥.



(راء)ی لاواز (ناسك):

لەگەڵ پیتی ( راء )ی ناسك کۆتایی زمان بەرزنابێت، و هیچ تەنگیەك لە (قوڕگ) دروست نابێت بە پێچەوانەی (راء)ی قەڵەو.

**نموونە:** ﴿ٱلرِّبَوٰاْ﴾ النساء: ١٦١.

# هەشتەم/ دەرچەی پیتەکاتی طـاء و دال و تـاء



دال و تـــاء



طـــاء

پێشـەوەی زمـان (طـرف اللسـان) لە گەڵ رەگـی دوو ددانی سـەرەوەی لای پێشەوە شوێنی دەرچوونی پیتەکانی (طـاء – دال – تـاء)، ئەم سێ پیتە بە سیفات لێك جیا دەكرێنەوە هەر پیتێك لەو پیتانە دەرچەیەكی تایبەت بە خۆی هەیە.

(ابن الجزري) رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ:

وَالطَّاءُ وَالدَّالُ وَتَا : مِنـهُ وَمِنْ عُلْيَا الثَّنَايَا...............

# ئەو هەڵانەی دەکرێن لە پیتەکانی

## ( طاء ـ دال ـ تاء )

١- تێکەڵ کردنی پیتی (تـــاء) بە (طـاء) بە هۆی زۆر لە یەك نزیکیان لەخوێندنەوەدا.

**نموونە :** ﴿ٱسۡتَطَٰعُواْ﴾ البقرة : ٢١٧.

٢- نابێـت سـیفەتی (الهمـس) بـە پیتی( طـاء) بدەین، بـە تایبەتی کە (ساکن) بێت.

**نموونە :** ﴿شَطۡرَهُۥ﴾ البقرة : ١٥٠.

٣- گۆڕینی پیتی (تـــاء) بە(طاء)بە هۆی هاتنی لە تەنیشت پیتی قەڵەو.

نموونە : ﴿ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ الفاتحة : ٦.

٤- گۆڕینی پیتی (تـــاء)بە (طـــاء)بە هۆی هاتنیان لە تەنیشت یەکتری.

**نموونە :** ﴿وَقُولُواْ حِطَّةٞ نَّغۡفِرۡ لَكُمۡ خَطَٰيَٰكُمۡۚ﴾ البقرة : ٥٨.

٥- گۆڕینی پیتی (دال) بە (تاء) بە هۆی لە یەك شوێن دەرچوونیان و بایەخ نەدان بە سیفەتی هەژان (القلقلة) لە پیتی (دال).

**نموونە :** ﴿وَأَعۡتَدۡنَا﴾ النساء :٣٧.

٦- تێکەڵکردنی پیتی (دال) بە (تـــاء) بەهۆی بایەخ نەدان بە سیفەتی (الجهر) لەپیتی (دال)دا.

**نموونە :** ﴿ٱلدِّينِ﴾ الفاتحة :٤.

## نۆیەم/ دەرچەی پیتەکانی صاد و سین زای



(صـــاد)



(سیـن و زاي)

پێشەوەی زمان ( طرف اللسان ) لەسەر دوو ددانی خوارەوە لەبەشی ناوەوە دەنگ لە نێوان دوو دووانەی سەرەوە و خوارەوە دروست دەبێت.

( ابن الجزري ) رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ:

...................... والصَّفِيرُ :

مُسْتَكِنْ مِنْهُ وَمِنْ فَوْقِ الثَّنايَا السُّفْلَى ........................

# ئەو هەڵانەی دەکرێن لە پیتەکانی

## (صـاد - سیـن - زاي) :

١- گۆڕینی پیتی (صاد) بە (سین).

نموونە : ﴿مَخۡمَصَةٍ﴾ المائدة : ٣.

٢- گۆڕینی پیتی (صاد) بە (زاي) بە تایبەتی (همزة) ی پچڕاوی لە پێش بێت.

نموونە : ﴿وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثٗا﴾ النساء : ٨٧.

٣- گۆڕینی پیتی (زاي) بە (سین) بە هۆی بایەخ نـەدان بە سیفەتی (الجهر) لە پیتی (زاي) کە تەنها بەو سیفەتە لێك جیا دەکرێنەوە .

نموونە : ﴿وَٱلرُّجۡزَ﴾ المدثر: ٥، ﴿رِزۡقًا﴾ النحل : ٧٣.

٤- گۆڕینی پیتی (سین) بە (صاد) بەهۆی هاتنی لە تەنیشت پیتی قەڵەو.

نموونە : ﴿بَسَطتَ﴾ المائدة: ٨٢، ﴿يُسۡقَوۡنَ﴾ المطففين: ٢٥، ﴿يَسۡطُونَ﴾ الحج: ٧٢.

٥- گۆڕینی پیتی (سین) بە (زاي).

نموونە : ﴿ٱلۡمَسۡجِدِ﴾ البقرة : ١٩٦.

بە تایبەتی لەم نموونە : ﴿رِجۡسًا إِلَىٰ رِجۡسِهِمۡ﴾ التوبة: ١٢٥.

## دەیەم/ دەرچەی پیتەکانی ظـاء و ذال و ثـاء



(ذال- ثـاء)　　　　(ظـاء)

پێشەوەی زمان (طرف اللسان) لە گەڵ تیغی دووانەی سەرەوە شوێنی دەرچوونی ئەم سێ پیتەیە (ظـاء - ذال - ثـاء)
(ابن الجزري) رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ:

................... والظَّاءُ وَالذَّالُ وَثَـا : لِلْعُـلْيَا

مِن طَرَفَيهِمَا.........

### تێبینی /

لە جیاوازی نێوان ئەم دوو وێنەیە بۆمان دەردەکەوێت لە پیتی (ظـاء) کۆتایـی زمـان بەرز دەبێتـەوە و تەنگیەك لە (قورگ) دروسـت دەبێت، بەڵام لە پیتی (ذال – ثـاء) کۆتایی زمان بەرز نابێتەوە زمان لە باری ئاسایی دایە.

# ئەو هەڵانەی دەکرێن لە شوێنی دەرچوونی پیتەکانی

## ( ظـاء ـ ذال ـ ثـاء ) :

١- گۆڕینی پیتی (ظـاء) بە (ضـاد).

نموونە : ﴿أَظۡلَمُ﴾ البقرة : ١١٤.

٢- گۆڕینی پیتی (ظاء) بە پیتی (زاي)یەکی قەڵەو.

نموونە : ﴿ٱلظُّلُمَٰتِ﴾ البقرة : ٢٥٧.

٣- گۆڕینی پیتی (ذال) بە پیتی (زاي).

نموونە : ﴿ٱلَّذِينَ﴾ البقرة : ٣.

٤- تێکەڵ کردنی پیتی (ذال) بە پیتی (ثـاء).

نموونە : ﴿مِنۢ بَعۡدِ إِذۡنِهِۦ﴾ یونس : ٣.

٥- تێکەڵ کردنی پیتی (ثـاء) بە پیتی (سین).

نموونە: ﴿ٱلۡكَوۡثَرَ﴾ الكوثر : ١.

**تێبینی/**

چارەسەری ئەم هەڵانە بە ئاشکرا کردنی دەرچەی پیتەکان و بایەخ دان بە پێدانی سیفەتە (خۆیی یەکان) دەبێت کە لە خودی پیتەکان جیا نابێتەوە.

# دەرچەی پێشەوەی زمان ( مخارج طرف اللسان )

- نـــــون
- راء
- پیتەکانی پێشەوەی مەڵاشوو ( طاء ، دال ، تاء )
- پیتەکانی فیکە ( صاد ، سین ، زاي )
- پیتەکانی نزیك پدوو ( ظاء ، ذال ، ثاء )

# بەشەکانی زمـان




**تێبینی/**

دەبێ ئاگادار بین پێشەوەی زمان (طرف اللسان) جیاوازی هەیە لە گەڵ سەری زمان (رأس اللسان) هەروەك لەم وێنەیەدا دەردەکەوێ.

# بەشی چوارەمی سەرەکی دەرچەکان

## دەرچەی دوو لێوەکان

### یەکەم/ دەرچەی پیتی فاء



فاء : هەردوو دووانەی بڕەڕی سەرەوە دەدەین لە ناوەوەی لێوی خوارەوە .

نموونە : ﴿فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ﴾ .

(ابن الجزري) رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ:

........... وَمِنْ بَطْنِ الشَّفَهْ :
فَالْفَا مَعَ اطرافِ الثَّنَايَا الْمُشْرِفَهْ

### دووەم/ دەرچەی پیتی واوی(نا مەددی)



واوی (نامەددی):

لێوەکان بە بازنەیی و کراوەیی بۆ پێشەوە بێت لەگەڵ بەرز بوونەوەی کۆتایی زمان.

(ابن الجزري) رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ:

لِلشَّفَتَيْنِ : الْوَاوُ بَاءُ مِيْمُ ...........

نموونە : ﴿وَإِنَّ لَكَ مَوْعِدًا لَّن تُخْلَفَهُۥ﴾ طه: ٩٧.



### تێبینی/

بە بەرزبوونەوەی کۆتایی زمان لە دەربڕینی پیتی(واو) دەنگ بەرزنابێتەوە بۆ مەلاشووی سەروو، وە تەنگی لە قورگ دروست نابێت.

## دووەم/ دەرچەی پیتی بـاء



**بـاء :**

بە یەکتر گەیاندنی دوو لێوەکان بە بێ بوونی بۆشایی لە نێوانیاندا.

**نموونە:** ﴿فَٱنصَبۡ﴾ الشرح: ٧.

**تێبینی /**

زانایان پیتی (بـــاء) ناو دەبەن بە ( بەحری) پیتی (میم) یش ناو دەبەن بە (بەڕڕی) چونکە لەدەبڕینی پیتی (بـــاء) بەشی تەڕی لێوەکان بە کار دێت بەڵام لە لەدەبڕینی پیتی(میـم) بەشی ووشکی لێوەکان بەکاردێت.

## دووەم/ دەرچەی پیتی ( میـم )

**میم :**



بـە یەکتـر گەیاندنـی دوو لێـوەکان بەمەرجێك دەنگی مینگەی لە گەڵدابێت لـە بۆشـایی نـاو لـووت، زانایان بەشـی لێوەکانیـان لە پیتی (میــم) ناوناوە بە نیـوەی تـەواو کراو، وە بەشـی بۆشـایی ناو لووتیان (الخیشوم) ناوناوە بە نیوەی تەواو کار.

**نموونە:** ﴿أَلَمۡ يَعۡلَم﴾ العلق: ١٤.

# چەند تێبینی یەک لە سەر پیتەکانی

## (فاء - باء - واوی نامەددی):

١- پێویستە وریا بین پیتی (فــاء) نەگۆڕین بە پیتی (ڤ)ی کوردی بە هۆی زیاتر فشار خستنە سەر لێوی خوارەوە لە دیوی ناوەوە.

٢- نابێت پیتی (فاء) تێکەڵ بکرێت بە پیتی (واو) بە هۆی شوێنی دەرچوونیانەوە.

نموونە : ﴿لَا تَخَفْ وَلَا تَحْزَنْ﴾ العنكبوت: ٣٣.

٣- لە کاتی بە یەك گەیشتنی دوو (فاء)ی بزواو (متحرك) پێویستە (اظهار) بکرێت.

نموونە : ﴿أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْ﴾النساء:٢٨،

﴿ٱلْـَٔـٰنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمْ﴾ الأنفال:٦٦.

٤- پێویستە وریا بین پیتی (باء) نەگۆڕین بە پیتی (پ)ی کوردی.

بە تایبەتی لەم نموونەیە : ﴿أَصْحَـٰبَ ٱلسَّبْتِ﴾النساء: ٤٧.

٥- نابێت پیتی (باء) بە قەڵەوی بخوێندرێتەوە بە هۆی هاتنی لە تەنیشت پیتی قەڵەو. بە تایبەتی لەم وشانە :

﴿ٱلْبَرْقُ﴾ البقرة : ٢٠، ﴿ٱلْبَـٰطِلُ﴾الإسراء : ٨١، ﴿كِتَـٰبَ ٱللَّهِ﴾النساء : ٢٤.

٦- لە پیتی (واو)ی نا مەددی پێویستە فێرخواز راهێنان بە لێوەکانی بکات، وەك ئەم نموونانە :

﴿سَمَـٰوَٰتٍ﴾ البقرة : ٢٩، ﴿وَهُوَ﴾ البقرة : ٢٩، ﴿عَدُوٌّ﴾ البقرة : ٣٦.

﴿أَن لَّوْ﴾ سبأ : ٣، ﴿لَوَّوْا﴾ المنافقون : ٣، ﴿قَوْمِ﴾ إبراهيم : ٩.

٧- نابێت پیتی (واو) به قه‌ڵه‌وی بخوێندرێته‌وه به هۆی هاتنی له ته‌نیشت پیتی قه‌ڵه‌و. به تایبه‌تی له‌م وشانه :

﴿خَوَّانًا﴾ النساء: ١٠٧، ﴿قَوَّامِينَ﴾ المائدة : ٨.

٨- له پیتی (واو)ی نامه‌ددی له كاتی وه‌ستان له‌سه‌ری به (شه‌دده) پێویستی به پاڵه‌په‌ستۆی ده‌نگ هه‌یه له ده‌ربڕین.

نموونه: ﴿عَدُوٌّ﴾ البقرة : ٣٦.

# بەشی پێنجەمی سەرەکی دەرچەکان

## دەرچەی مینگە لە کاتی هەبوونی لە پیت

بریتیه لەو دەنگەی کە دەردەچێت لە بۆشایی ناو لووت (الخیشوم) وتایبەتە
بە (میم و نون) و بەردەوام لەگەڵیاندایەولێیان جیانابێتەوە.
(ابن الجزري) رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ:

( وَغُنَّةٌ : مَخْرَجُـهَا الخَيْشُومُ ) ..................



(نـــون) بێ مینگە نابێت



(میـــم) بێ مینگە نابێت

## تێبینی/

- دەبێـت فێرخـواز وریا بێت لە دەربڕینی پیتـی (میم) هەردوو لێوەکان لە سـەر یەکتر دابنێت و پەلەی تێدا نەکات ئەگەر نا سـیفەتی هەژان (قلقلة) وەردەگرێت.
- مینگـە (غنة) دەنگی هەیە و شـوێنی دەرچوونیشـی هەیـە، بەڵام وەك پیت (رسـم) و وێنەی نیە لە نوسیندا.
- نابێت پیتی (میم) بەقەڵەوی بخوێندرێتەوە بەهۆی هاتنی لە تەنیشت پیتی قەڵەو بە تایبەتی لەم وشانە :

﴿مَخۡمَصَةٍ﴾ المائدة: ٣، ﴿مَرَضًا﴾ البقرة: ١٠، ﴿ٱلۡمَصِيرُ﴾ الأنفال: ١٦.

# شوێنی دەرچوونی پیتەکانی زمانی عەرەبی



# ( إتمام حركات الحروف )

## تەواو هێنان و رێك و پێكی جووڵەی پیتەكان
## ( فتحة – ضمة – كسرة )



١- پێویستە لە سەر قورئان خوێن دەمی تەواو بكاتەوە لە كاتی دەربڕینی ئەو پیتەی كە (مفتوح )ـە، هەروەك چۆن پیتی (ألف) دەردەبڕێ، وەزمانیش لەباری ئاسایی دادەبێت٠



٢- پێویستە لە سەر قورئان خوێن دوو لێوەكانی بە بازنەی كراوەیی بۆ پێشەوە بێنێت لە كاتی دەربڕینی ئەو پیتەی كە (ضمة) یە، هەروەك چۆن پیتی (واو) دەردەبڕێ.



٣- پێویستە لە سەر قورئان خوێن چەناگەی خوارەوە دابەزێنێت و ناوەڕاستی زمان بەرزكاتەوە بۆ مەڵاشوی سەروو لە كاتی دەربڕینی ئەو پیتەی كە (مكسور)كەسرەی لەژێرە، هەروەك چۆن پیتی (یاء) دەردەبڕێ.



٤- ئەو پیتەی (ساكن)ـە لە شوێنی بنەڕەتی خۆی دەردەچێت بە بێ ئەوەی هیچ كام لەوانەی پێشتری لە گەڵدا بێت، وە بەگوێرەی سیفەتی پیتەكە تایبەتمەندی خۆی دەبێت. بۆنموونە پیتی (فاء)ی (ساكن).

## الوقف بدون (مدّ)

بریتیە لە وەستان لەسەر كۆتایی وشە بە مەرجێك پیتی پێش كۆتایی پیتی درێژ كردنەوە: ( َا ، ُو ، ِي ) و ( اللين ) : ( َو ، َي )نەبێت.

### تێبینی :

پێویستە فێر خواز ڕاهێنان بە زمان و شەویلاكی بكات لە دەربڕینی دوو پیتی زەنە دار (ساكن) لەدوای یەك.

وەكو (ابن الجزري) رەحمەتی خوای لێ بێ دەفەرموێ :

وَلَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ تَرْكِهِ        إلاَّ رِيَاضَةُ امْرِئٍ بِفَكِّهِ

# خشتەی وەستان (الوقف) لەسەرئەو وشانەی کە پیتەکانی درێژ کردنەوە ( ـَا ، ـُو ، ـِي ) لە پێش کۆتایی یان دانەهاتووە

| پیتەکان | وشـــــــه | زەنەداری بنەرەتی (سکون اصلی) | زەنەداری توش هاتوو (سكون عارض) |
|---|---|---|---|
| ل + ف | ﴿غُلْفُۢ﴾ البقرة: ٨٨ | ل | ف |
| ر + ض | ﴿وَٱلْأَرْضِ﴾ البقرة: ١٠٧ | ر | ض |
| أ + س | ﴿ٱلْبَأْسِ﴾ البقرة: ١٧٧ | أ | س |
| م + هـ | ﴿فَلْيَصُمْهُ﴾ البقرة: ١٨٥ | م | هـ |
| ت + ل | ﴿ٱلْقَتْلِ﴾ البقرة: ١٩١ | ت | ل |
| د + ي | ﴿ٱلْهَدْيِ﴾ البقرة: ١٩٦ | د | ي |
| س + ل | ﴿وَٱلنَّسْلَ﴾ البقرة: ٢٠٥ | س | ل |
| ث + م | ﴿بِٱلْإِثْمِ﴾ البقرة: ٢٠٦ | ث | م |
| م + ر | ﴿ٱلْأَمْرُ﴾ البقرة: ٢١٠ | م | ر |
| ف + و | ﴿ٱلْعَفْوَ﴾ البقرة: ٢١٩ | ف | و |

| | | | |
|---|---|---|---|
| س + م | ﴿وَٱلۡجِسۡمِ﴾ البقرة: ٢٤٧ | س | م |
| ت + هـ | ﴿فَأَهۡلَكۡتَهُ﴾ آل عمران: ١١٧ | ت | هـ |
| ف + ر | ﴿ٱلۡكُفۡرِ﴾ آل عمران: ١٧٦ | ف | ر |
| ص + ف | ﴿ٱلنِّصۡفُ﴾ النساء: ١١ | ص | ف |
| ح + ت | ﴿ٱلسُّحۡتَ﴾ المائدة: ٦٢ | ح | ت |
| هـ + و | ﴿وَلَهۡوٌ﴾ الأنعام: ٣٢ | هـ | و |
| ح + ر | ﴿وَٱلۡبَحۡرِ﴾ الأنعام: ٥٩ | ح | ر |
| ب + ل | ﴿قَبۡلُ﴾ الأعراف: ١٧٣ | ب | ل |
| هـ + د | ﴿عَهۡدٍ﴾ الأعراف: ١٠٢ | هـ | د |
| ر + ش | ﴿ٱلۡعَرۡشِ﴾ يونس: ٣ | ر | ش |
| ل + هـ | ﴿بَدِّلۡهُ﴾ يونس: ١٥ | ل | هـ |
| ل + م | ﴿ٱلۡعِلۡمُ﴾ يونس: ٩٣ | ل | م |
| ب + ح | ﴿ٱلصُّبۡحُ﴾ هود: ٨١ | ب | ح |
| ئـ + ب | ﴿ٱلذِّئۡبُ﴾ يوسف: ١٣ | ئـ | ب |
| غ + ي | ﴿وَٱلۡبَغۡيِ﴾ النحل: ٩٠ | غ | ي |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ب + غ | ﴿نَبۡغِ﴾ الكهف: ٦٤ | ب | غ |
| ح + ي | ﴿بِٱلۡوَحۡيِ﴾ الأنبياء: ٤٥ | ح | ي |
| ف + ل | ﴿ٱلۡكِفۡلِ﴾ الأنبياء: ٨٥ | ف | ل |
| ن + هـ | ﴿مِنۡهُ﴾ الحج: ٧٣ | ن | هـ |
| م + س | ﴿بِٱلۡأَمۡسِ﴾ القصص: ١٩ | م | س |
| ر + هـ | ﴿ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُ﴾ القصص: ٢٦ | ر | هـ |
| هـ + ب | ﴿ٱلرَّهۡبِ﴾ القصص: ٣٢ | هـ | ب |
| ع + د | ﴿بَعۡدُ﴾ الروم: ٤ | ع | د |
| ك + ر | ﴿ٱلذِّكۡرِ﴾ ص: ١ | ك | ر |
| ع + ض | ﴿بَعۡضٍ﴾ الجاثية: ١٩ | ع | ض |
| هـ + ر | ﴿ٱلدَّهۡرُ﴾ الجاثية: ٢٤ | هـ | ر |
| ض + ن | ﴿يَحِضۡنَ﴾ الطلاق: ٤ | ض | ن |
| ض + ن | ﴿وَيَقۡبِضۡنَ﴾ الملك: ١٩ | ض | ن |
| هـ + ل | ﴿كَٱلۡمُهۡلِ﴾ المعارج: ٨ | هـ | ل |
| هـ + ن | ﴿كَٱلۡعِهۡنِ﴾ المعارج: ٩ | هـ | ن |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ص + ر | ﴿كَٱلۡقَصۡرِ﴾ المرسلات: ٣٢ | ص | ر |
| ف + ر | ﴿صُفۡرٞ﴾ المرسلات: ٣٣ | ف | ر |
| ج + ع | ﴿ٱلرَّجۡعِ﴾ الطارق: ١١ | ج | ع |
| د + ع | ﴿ٱلصَّدۡعِ﴾ الطارق: ١٢ | د | ع |
| ص + ل | ﴿فَصۡلٞ﴾ الطارق: ١٣ | ص | ل |
| ز + ل | ﴿بِٱلۡهَزۡلِ﴾ الطارق: ١٤ | ز | ل |
| ج + ر | ﴿وَٱلۡفَجۡرِ﴾ الفجر: ١ | ج | ر |
| ت + ر | ﴿وَٱلۡوَتۡرِ﴾ الفجر: ٣ | ت | ر |
| د + ر | ﴿ٱلۡقَدۡرِ﴾ القدر: ١ - ٢ | د | ر |
| هـ + ر | ﴿شَهۡرٖ﴾ القدر: ٣ | هـ | ر |
| س + ر | ﴿خُسۡرٍ﴾ العصر: ٢ | س | ر |

بۆ دەربڕینی پیتەکان پێویستمان بەم نزاو پارانەوەیە ، کە پێغەمبەر موسی ( علیه السلام ) داوای لە خوای پەروەردگار کرد ﴿رَبِّ ٱشۡرَحۡ لِي صَدۡرِي ، وَيَسِّرۡ لِيٓ أَمۡرِي ، وَٱحۡلُلۡ عُقۡدَةٗ مِّن لِّسَانِي ، يَفۡقَهُواْ قَوۡلِي﴾ .

# سیفەتی پیتەکان

هەروەك لە پێشتر بۆمان روون بۆوە کە بە زانینی شوێنی دەرچوونی پیتەکان، قورئانخوێن بە شێوەیەکی زۆر باش و بە زمانێکی پاراو پیتەکانی قورئان دەخوێنێ .

## سیفەت لە زمانەوانیدا :

بریتیە لە هەڵسان بە شتێك لە واتاماددی یە کان (بینراوەکان) یان مەعنەوییەکان (نە بینراوەکان)

ماددی یە کان (بینراوەکان)، وەکو : درێژی، کورتی، سپیاتی، سۆراتی... هتد..

مەعنەویەکانیش (نە بینراوەکان) وەکو : زانست، ئەدەب، خانەدانی، زیرەکی، حەیا .. هتد..

## سیفەت لە زاراوەدا:

بریتیە لە چۆنیەتی دەرکەوتنی پیت لە شوێنی دەرچوونی، کە لە ڕێگەی ئەوەوە دەزانین ئەم پیتە ئاشکرایە واتا (مجهور) یان چرپە – شاراوەیە - (مهموس) یان توند – بەهێزە - (شدید) یان لەرینەوەیە - هەژانە - (مُقَلْقل)ە و ۰۰۰۰۰۰۰ هتد..

# سوودەکانی زانینی سیفەتی پیتەکان :

١- لێك جیاکردنـەوەی پیتەکانـی هاوبـەش و لێـك نزیك لـە دەرچەدا : (ابـن الجـزري) لە (النشـر) دا دەڵێ : هەر پیتێك هاوبـەش بێت لەگەڵ پیتێکی تری سـیفەتەکاندا تەنیا بە دەرچە نەبێت لێی جیاناکرێتەوە، هەر پیتێکیش هاوبەش بێت لەگەڵ پیتێکی تردا لە دەرچەدا تەنیا بە سیفەتەکان نەبێت لێك جیاناکرێتەوە، ئەگەر ئەوە نەبوایە ئەوا دەنگی پیتـەکان یـەك دەنگ دەبوو لە بیسـتندا وەکو دەنگـی ئاژەڵەکانیان لێ دەهـات هیـچ واتاییێکیان نەدەبەخشـی و، خـودی پیتەکانیش لە یەکتر جیانەدەکرانـەوە . بـۆ نمونـە : پیتەکانـی (ظـاء - ذال - ثـاء) یـەك دەرچەیان هەیە، ئەگەر سـیفەتی (الإسـتعلاء) بەرزبوونەوو، ( الإطباق) داخستن و بەیەك گەیاندن لە پیتی (ظاء) دا نەبووایە، دەبوو بە (ذال)، ئەگەر سیفەتی (الهمس) لە (ثاء) دا نەبووایە دەبوو بە (ذال).

٢- ناسینی هێزی پیتەکان و جیاکردنەوەیان لە بێ هێزەکانیان، بۆ ئەوەی بزانـدرێ کامـە دروسـتە تێکهەڵکێـش بکـرێ لەگەڵ غەیـری خۆیداو، کامەیان دروست نیە تێکهەڵکێش بکرێ : جا ئەو پیتە بەهێزەی هێزی زیاترە لە پیتێکی تر دروست نیە بخرێتە ناو پیتی بێ هێز، بۆ ئەوەی ئـەو هێـزە زیـادەی لە دەسـت نـەدا، بۆ نمونـە : پیتی (طـاء) پیتێکی بەهێـزە، پیتـی (تاء) یـش پیتێکی بێ هێزە، جا ئەگەر (تاء)ی (سـاکنة) لـە پێـش (طاء) دا هـات ئەوا بەتەواوی (إدغام کامـل) لە پیتی (طاء) دا تێکهەڵکێش دەکرێ . وەکو : ﴿ وَدَّت طَّآئِفَةٌ ﴾ آل عمران : ٦٩.

بەڵام ئەگەر (طاء) بە پێش (تاء) کەوت، ئەوا ( طاء ) لە (تاء) دا بەتەواوی

تێکهەڵکێش (الإدغام) ناکرێ، بەڵکو بەناتەواوی تێکهەڵکێش دەکرێ بۆ ئەوەی ئەو هێزە زیادەی لە (طاء) دا هەیە لە دەست نەچێت هەردوو سیفەتی (الإستعلاء) و ( الإطباق ) بەرزبوونەوەو بەیەك گەیاندن و هەموو سیفەتەکانی تریشی بمێنێتەوەو سیفەتی (قلقلة) ی نەمێنێت،

وەکو: ﴿لَئِنۢ بَسَطتَ﴾ المائدة: ٢٨.

بەڵام لە هەندێ جاردا پیتی بەهێز لە بێ هێزدا تێك هەڵدەکێشرێ، ئەگەر ریوایەتەکە بە (إدغام) تێکهەڵکێشکردن هاتبوو، قسەی ئێمە کە دەڵێین : ( بەهێز لە بێ هێزدا هەڵناکێشرێ ) ئەوە لە رووی قوڵبوونەوەو لێکۆڵینەوەیە، بەڵام ریوایەت و گێڕانەوە بەپێش لێکۆڵینەوەو لێوردبوونەوە دەکەوێ، چونکە ئەو بنەمایەی کاری پێ دەکرێ دەربارەی قورئان ریوایەتە، وەکو وشەی : ﴿أَلَمۡ نَخۡلُقكُّم﴾ المرسلات: ٢٠.

٣- جوان دەربڕینی پیتەکان : لە کاتێکدا لە یەك وشەدا کۆببنەوە یان هەندێکیان دراوسێی هەندێکیان بن.

وەکو جیاکردنەوەی پیتی باریك (الاستفال) لە پیتی (التفخیم) و قەڵەو لە کاتێکدا ئەو پیتە باریکە پیتێکی قەڵەوی لە تەنیشت بێت یان بەپێچەوانەوە،

**نموونە:**

﴿يَخۡتَصُّ﴾ البقرة: ١٠٥، ﴿حَصۡحَصَ﴾ يوسف: ٥١، ﴿صَفۡصَفٗا﴾ طه: ١٠٦.

هەروەها بە رزگارکردنی پیت لە مینگە ئەگەر هاتوو پیتێکی بە مینگەی لە تەنیشت هاتبوو نموونە :

﴿فِي مَخۡمَصَةٍ﴾ المائده: ٣، ﴿تُنۡهَوۡنَ﴾ النساء: ٣١، ﴿ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ الرعد: ٣٥.

## رای زانایـان لە ژمارەی سیفەتی پیتەکان:

زانایان رای جیاوازیان هەیە لە سەر ژمارەی سیفەتی پیتەکان، هەندێ لە زانایان ئەڵێن (حەڤدە) سـیفەتە وەکو ئیمامی (ابن الجزري)، بەڵام هەندێ لە زانایان ئەڵێن (شازدە) سیفەتە وەکو پێشەوا (شاطبي و سخاوي) لە بەر ئـەوەی هەردووکیـان هەڵسـان بە لادانی هەردوو سـیفەتی زمـان تیژی و قەدەغەبـوون (الإذلاق - الاصمـات) لەبەر ئـەوەی هیچ پەیوەندییەکیان بە زانسـتی تەجوید نییە، بەڵام هەڵسـان بە زیادکردنی سـیفەتی ( الهوائية ) لە پیتی (ألف) واتا ئەو سیفەتەی کە بە دەرکردنی هەوا لە دەم دەردەچێ، وە هەندێ لە زانایان (بیسـت) سـیفەت بۆ پیتەکان دەژمێرن وە هەندێکی تر ئەڵێن پیت (چل) سیفەت و نازناوی هەیە.

ئێمـە مەزهەبـی (ابـن الجزري)مـان هەڵبـژارد لەبەر ئـەوەی زۆربەی رای زانایان لەسەر ئەوەن کە (حەڤدە) سیفەتە .

## دابەش کردنی سیفەتەکان:

دەربارەی دابەشکردنی سیفەتی پیتەکان ( ابن الجزري ) ڕەحمەتی خودای لێ بێت و زۆرینەی زانایە پێشینەکان بۆ هاودژەکان (دە) سیفەتیان داناوە، وە بۆ ئەو سیفەتانەش کە هاودژیان نیە (حەوت) یان داناوە . ئێمەش لێرەدا جگە لەم حەڤدە سیفەتە ئاماژە بە هەردوو سیفەتی شاراوە (الخفاء) و مینگە (الغنـة) دەکەین بەم شـێوەیە: پیتەکانـی (الخفاء) بریتین لە (چوار) پیت : (هاء) و پیتەکانی درێژکردنەوە (المـــدّ) ( ا، و، ي ) کە لە وشەی (هاوي) دا کۆکراونەتەوە . وە پیتەکانی(الغنة) ش بریتین لە: (م، ن).

# سیەفەتە هاودژەکان

## چرپە - شاراوە - (الهمس)

## و

## ئاشکرا (الجهر)

پیتەکانی زمانی عەرەبی لە رووی هەناسە گیربوون و هەناسە رۆیشتن

**چرپە (شاراوە) (١٠)**

(سَكَتَ فَحَثَّهُ شَخْصٌ)

**ئاشکرا (١٩)**

ئەو پیتانەی کە ماون

# یەکەم/ أ- چرپە (الهمس)

لە زمانەوانیدا : چرپە — شاراوە -

لە زاراوەدا[٧]: بریتیە لە شاراوەیی دەنگ لە بیستن دا لە ئەنجامی گرانەوەی دوو دەنگە ژێیەکان و نەهەژانیان بە ڕۆیشتنێکی هەوای هەناسە لە پیتەکانی (الهمس)، وەژمارەی پیتەکانیشی بریتین لە دە پیت کە کۆکراونەتەوە لەم رستەیەدا :( فَحثهُ شَخصٌ سَكَتْ )، بەهێزترین پیتەکانی (الهمس) بریتین لە : (صاد، خاء)، و پیتەکانی مام ناوەندی: (کاف - تاء - سین - شین) ولاوازترینی پیتەکان : (فاء، حاء، ثاء، هاء).

(ابن الجزري) رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ:

مَهْمُوسُهَا : فَحَثَّهُ شَخْصٌ سَكَتْ.................




وێنەی راستەقینە لە دوو دەنگە ژێیەکان لە باری چرپەدا

نموونە : ﴿إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ﴾ التكوير: ١.

٧) یان بریتیە لە ڕۆیشتنی هەوای هەناسە لەکاتی دەربرینی پیتەکە لەبەر لاوازی پشت بەستان بەدەرچەکە ( مخرج ).

## ب- ئاشكراكردن (الجهر)

لە زمانەوانیدا : واتە ئاشكراكردن.

لە زاراوەدا[٨] : بریتیە لە ئاشكرا كردنی دەنگ و بیستنی بەروونی لە ئەنجامی لێكدانی دوو دەنگە ژێیەكانی و هەژانیان و گیربوونی هەوای هەناسە لە پیتەكانی ئاشكرا (الجهر) كە ژمارەیان بریتی یە لە (١٩) پیت، كە كۆكراونەتەوە لەم رستەیەدا (عَظُمَ وَزْنُ قارِئٍ غَضٍ ذِي طَلَبٍ جدّ)

(ابن الجزري) رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ:

صِفَاتُها : جَهْرٌ وَ رِخْوٌ مُسْتَفِلْ      مُنفَتِحٌ مُصْمَتَةٌ : وَالضِّدَّ قُل




وێنەی دوودەنگە ژێیەكان لە باری ( الجهر ) ئاشكرادا.

**نموونە:** ﴿اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ﴾ القمر: ١.




شوێن و جێگەی دوو دەنگە ژێیەكان لە باری چرپە (الهمس) و ئاشكرادا (الجهر).

---

٨) یان بریتیە لەدەرنەچونی هەوای هەناسە لەكاتی دەربرینی پیتەكە بەهۆی بەهێزی پشت بەستنی بەدەرچەكە ( مخرج ).

# پیتەکانی زمانی عەرەبی
## لە رووی رۆیشتنی دەنگ لە شوێنی دەرچەی پیت

| خاوی | لە نێوان توندی و خاوی | توندی |
|---|---|---|
| ئەو پیتانەی کە ماون | (لِنْ عُمَر) | (أَجِدُ قَطٍ بَكَتْ) |

## دووەم/ أ- توندی (الشدة)

لە زمانەوانیدا : واتە بەهێزی و توندی.

لە زاراوەدا[٩] : بریتیە لە تێپەڕنەکردن و گیرانی دەنگ لە دەربڕینی پیتی توندی(الشدة) لە ئەنجامی داخرانی شوێنی دەرچەکە.

(ابن الجزري) رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ:

........... شَدِيْدُهَا لَفْظُ : أَجِدْ قَطٍ بَكَتْ



نموونە : جیم

﴿وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجْنُونٍ﴾ التكوير: ٢٢.

٩) یان بریتیە لە رێنەکردن و گیرانی دەنگ لەکاتی دەربڕینی پیتەکە لەبەر ئەو پەری هێزی پشت بەستنی بەدەرچەکە (مخرج).

# پیتەکانی توندی

## ئاشکراکردن

( قُطْبُ جَدٍّ + الهَمزة )

## چرپە و شاراوە

( الكاف ، التَّاء )

**دەرچوونی دەنگ دوای گیرانەوەی لەو پیتەی کە توند و ئاشکرایە**



پیتی (جیم) لە کاتی دەرچوونی دەنگەکەی.



پیتی (جیم) لە دوای دەرچوونی دەنگەکەی.

پاڵە پەستۆی دەنگە گیراوەکە لە دواوەی دەرچەی پیتەکە و پاشان دەرچوونی نیشانە - (سهم)ی وێنەی لای چەپ - زمان ڕەوانی و هاوسەنگی دەنگ دیاری دەکات، پێویستە ڕاهێنان بە زمان بکرێت بە پیتی (شەددە).

**نموونە :**

﴿وَإِذَا ٱلْبِحَارُ فُجِّرَتْ﴾ الانفطار:٣، ﴿وَلَا جِدَالَ فِي ٱلْحَجِّ﴾ البقرة: ١٩٧،

﴿إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْفُجَّارِ لَفِي سِجِّينٍ﴾ المطففين: ٧.

# دەرچوونی هەوای هەناسە دوای گیرانەوەی دەنگ لە پیتی توند(شدید) و چرپە(مهموس)

### تێبینی /

سیفەتی توندی و چرپە لە پیتی ( كاف و تاء ) دوو سیفەتن لەسەر ریزبەندی ئەم دوو پیتانە لە دەست پێكا سیفەتی توندی تیایان دا بەرجەستە دەبێت لە كۆتاییدا سیفەتی چرپە بە دوایەوە دێت.



پیتی (كاف) لە كاتی دەرچوونی هەوای هەناسە.



پیتی (كاف) لە كاتی گرتنەوەی دەنگ.

دەرچوونی هەناسە دوای گیرانەوەی دەنگ لە كاتی دەربڕینی پیتی توندی و چرپە ئەمەشیان لە پیتی (كاف و تاء).

نموونە :

﴿فِي شَكٍّ﴾ سبأ: ٢١، ﴿وَإِذَا ٱلْبِحَارُ سُجِّرَتْ﴾ التكوير: ٦.

## ب- خاوی و نەرمی ( الرخوة )

لە زمانەوانیدا : واتە خاوی و نەرمی.

لە زاراوەدا[10]: بریتیــە لە ڕۆیشتنی تەواوی دەنگی پیتە خاوەکان لە کاتی تێپەڕبوونی لە شوێنی دەرچوونی، ژمارەی پیتە خاوەکان (الرخوة) شـازدە پیتن :

( حاء ، خاء ، ذال ، زاي ، ثاء ، سین ، شین ، ألف ، صاد ، ضاد ، ظاء ، واو ، غین ، فاء ، هـاء ، یاء )



نموونە : شیـن

نموونەی پیتی (شین) : ﴿عَشْرًا﴾ القصص: ٢٧.

---

١٠) یان بریتیە لە ڕێکردنی دەنگ لەکاتی دەربرینی پیتەکە بەهۆی لاوازی پشت بەستنی بە دەرچەکە ( مخرج ).

## ج- مام ناوەندی (التوسط)

له زمانەوانیدا : واتە مام ناوەندی.

له زاراوەدا : بریتیە لە ڕۆیشتنی بەشێکی دەنگەکە لە شوێنی دەرچوونی پیتی مام ناوەند بە هۆی تەواوی دانە خرانی دەرچەی پیتەکان، پیتە مام ناوەندییەکان (التوسط) پێنج پیتن: (لِنْ عُمَرْ).

## مام ناوەندی لە پیتی (لام) دا

بریتیە لە ڕۆیشتنی بەشێکی دەنگەکە لە کاتی دەربڕینی پیتی (لام) بە هۆی ڕێگری پێشەوەی سەرپشتی زمان .

(ابن الجزري) ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەفەرموێ:

وَبَيْنَ رِخْوٍ وَالشَّدِيدِ : ( لِنْ عُمَر ) ....................






دیمەنێکی ڕوون و بەرچاو لە کاتی دەربڕینی پیتی (لام) لە دەمدا.

## مام ناوەندی لە پیتی (راء)

بریتیـــە لە ڕۆیشتنی دەنگ لە کاتی دەربڕینی پیتی (راء) بە هۆی ڕێگری زۆرترین بەشـی پێشـەوەی سـەر پشـتی زمان (طرف اللســان) کەرێگرە لە دەرچوونی دەنگی پیتی (راء) بەتەواوی.





دیمەنێکـی ڕوون و بەرچـاو لە دەربڕینی پیتـی (راء) ڕوون دەبێتــەوە مانــەوەی بۆشـاییەکی کـەم لـە کۆتایـی پێشــەوەی سـەرپشـــتی زمـــان (طـرف اللســان) بەشێکی دەنگ لەو بۆشاییە تێدەپەڕێت.

## مام ناوەندی لە پیتەکانی (نون) و (میم)

بریتیـە: لە ڕۆیشتنی بەشێکی دەنگەکە بە دەربڕینی پیتی (نون) و (میـم) دا بە هۆی کرانەوەی بەشی بۆشایی لووت (الخیشوم) لە مینگەدا و داخرانی بەشێکی دەم لە هەردوو پیتدا وەك چۆن لەم دوو وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە.



(نـــون)



(میـــم)

نموونە : ﴿فَأَتَمَّهُنَّ﴾ البقرە: ١٢٤، ﴿فَإِنْ﴾ القصص: ٢٧، ﴿أَمْرُهُمْ﴾ فاطر: ٤٠.

# مام ناوەندی لە پیتی (عین)




بریتیە لە رۆیشتنی بەشێکی دەنگەکە لە دەربڕینی پیتی (عین) بە هۆی گەرانەوەی زمانە بچکۆڵە بۆ دواوە.

**نموونە :**

﴿ لَآ أَعۡبُدُ مَا تَعۡبُدُونَ ﴾ الكافرون : ٢.

# سیەفەتە هاودژەکان

## بەرزی (الإستعلاء)
## و
## نزمی (الإستفال)

پیتەکانی زمانی عەرەبی
لە رووی بەرزیو نزمی دەنگ

**بەرزی**

دەنگ بەرز دەبێتەوە بەرەو مەڵاشووی سەرەوە لە دەربڕینی پیتەکانی بەرزی ( الإستعلاء )

خُصَّ ضَغْطٍ قِظْ

**نزمی**

دەنگ بەرز نابێتەوە بەرەو مەڵاشووی سەرەوە لە دەربڕینی پیتەکانی نزمی ( الإستفال )

( ئەوەی ماوەتەوە لە پیتەکانی تر جگە لە پیتەکانی بەرزی )

# سێیەم/ أ- بـەرزی (الإستعلاء)

له زمانەوانیدا : واته بەرزی و بەرزکردنەوه.

لـه زاراوەدا : بریتیـــه لـه بەرز بوونـــەوەی ئەوپەڕی زمـان[11] بەرەو رووی مەڵاشـووی سـەرەوه له دەربڕینـی پیتەکانی بـەرزی، پیتەکانی بەرزی کۆ کراوەتەوه له (خُصَّ ضَغْطٍ قِظْ) .

وەك (ابن الجزري) رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ:

وَسَبْعُ عُلْوٍ: (خُصَّ ضَغْطٍ قِظْ)حَصَرْ ..................

## ب- نزمی (الإستفال)

له زمانەوانیدا : واته نزمی و دابەزین.

لـه زاراوەدا : بریتیـــه لـه دابەزینـی دەنـگ[12] بـەرەو خـوارەوەی زمان له دەربڕینی پیتەکانی ( الإستفال )نزمی،پیتەکان کۆکراونەتەوه لەم رستەیەدا:

( ثَبَتَ عِزٌّ مَنْ يُجَوِّدْ حَرْفَه سَلَّ إِذ شَكَا ).

---

١١) له پێناسەی بەرزی هەم دەنگ بەرز دەبێتەوه و هەم ئەوپەڕی زمانیش بەرز دەبێتەوه بەرەو رووی مەڵاشووی سەرەوه ئەوەش له بەر تەنگ بوونی قورگه و وەسەرکەوتنی دەنگی پیتەکەیه بۆ بەرزی مەڵاشووی سەروو کەشایانی بەرز کردنەوەیه.

١٢) له پێناسەی ( الإستفال ) هەم زمان دادەبەزی هەم دەنگ دادەبەزی بەرەو خوارەوەی دەم، تەنها له پیتی ( واو ) کۆتایی زمان بەرز دەبێتەوه بەڵام دەنگ بەرز نابێتەوه.

# پایەکانی قەڵەوکردن:

1- فتحة : پیتەکە خۆی (فتحة) بێت و(ألف)ی بە دوا هاتبێت.

وەك : ﴿خَٰلِدِينَ﴾ البقرة : ١٦٢.

2- فتحة : پیتەکە خۆی (فتحة) بێت وە(ألف)ی بە دوادا نەهاتبێت.

وەك: ﴿طَبَعَ﴾ النساء : ١٥٥.

3- ضمة: پیتەکــە خۆی (ضمة) بێت، وەك : ﴿خُذُواْ﴾ البقرة : ٦٣.

4- سكون : پیتەکە خۆی (سکون) بێت، وەك : ﴿يَطْبَعُ﴾ الاعراف : ١٠١.

5- کسرة : پیتەکە خۆی (کسرة) بێت، وەك : ﴿طِبَاقًا﴾ الملك : ٣.

## خشتەی پیت و پایەکانی قەڵەوکردن (التفخیم)

| پیت | پیتەکە خۆی (فتحة) بێت (ألف)ی بەدواهاتبێت | پیتەکە (فتحة) بێت (ألف)ی بەدوا دانەهاتبێت | پیتەکە خۆی (ضمة) بێت | پیتەکە خۆی (سکون) بێت | پیتەکە خۆی (کسرة) بێت |
|---|---|---|---|---|---|
| الطاء | ﴿طَآئِعِينَ﴾ | ﴿وَطَبَعَ﴾ | ﴿وَطُبِعَ﴾ | ﴿نَطْبَعُ﴾ | ﴿طِبْتُمْ﴾ |
| الضاد | ﴿ٱلضَّآلِّينَ﴾ | ﴿ضَرَبَ﴾ | ﴿فَضُرِبَ﴾ | ﴿يَضْرِبُ﴾ | ﴿ضِغْثًا﴾ |
| الصاد | ﴿ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ | ﴿صَبَرَ﴾ | ﴿فَصُرْهُنَّ﴾ | ﴿أَصْبِرُواْ﴾ | ﴿وَصِهْرًا﴾ |
| الظاء | ﴿ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ | ﴿ظَلَمَهُمُ﴾ | ﴿لَظُلْمٌ﴾ | ﴿يَظْلِمُونَ﴾ | ﴿ظِلَٰلٍ﴾ |
| القاف | ﴿ٱلْقَادِرُ﴾ | ﴿لَقَدْ﴾ | ﴿قُدِرَ﴾ | ﴿لَا يَقْدِرُونَ﴾ | ﴿قِيلَ﴾ |
| الغين | ﴿ٱلْغَٰفِلُونَ﴾ | ﴿وَغَرَّهُمْ﴾ | ﴿غُلِبَتِ﴾ | ﴿سَتُغْلَبُونَ﴾ | ﴿مِنْ غِلٍّ﴾ |
| الخاء | ﴿ٱلْخَٰسِرُونَ﴾ | ﴿خَسِرَ﴾ | ﴿ٱلْخُسْرَانُ﴾ | ﴿يَخْلُقُ﴾ | ﴿خِفْتُمْ﴾ |

# پیتە بەرزەکان و نزمەکان لە شێوەی ڕووتێکردنی دەنگ




دەنگ بەرز دەبێتەوە بە پیتێکی بەرز بوو:

نموونە : ﴿وَٱللَّهُ يَقُولُ ٱلْحَقَّ﴾ الأحزاب: ٤.




دەنگ نزم دەبێتەوە بە پیتێکی نزم بوو:

نموونە : ﴿فَأَهْلَكْنَٰهُمْ﴾ الشعراء: ١٣٩.

# قەڵەوی (التفخیم)
# و باریک (ناسك)ی (الترقیق)

## قەڵەوی (التفخیم)

له زمانەوانیدا : گەورە کردن.

له زاراوەدا : بریتیه له قەڵەویەك کە دەچێتە سەر پیت و دەم پڕ دەبێت بە دەنگ دانەوەی، ئەوەش لە بەر تەنگ بوونی (قوڕگ) و سەرکەوتنی دەنگی پیتەکە بۆ بەرزی مەڵاشووی سەروو، کەئەمەش شایانیی پیتە (مستحق الحرف)، وەك لەم وێنەیەدا دەردەکەوێت.




نموونە : ﴿ وَأَقْبَلَ ﴾ الطور: ٢٥.

## ناسك - (الترقیق)

له زمانەوانیدا : باریکی - ناسك

له زاراوەدا : ناسك کردن :

بریتیە له باریك کردنێك کە دەچێتە سەر پیت و دەم پڕ نابێت بە دەنگ دانەوەی، ئەوەش لە بەر تەنگ نەبوونی (قوڕگ) و سەرنەکەوتنی دەنگی پیتەکەیە بۆ بەرزی مەڵاشووی سەروو، کەئەمەش شایانیی پیتە(مستحق الحرف)، وەك لەم وێنەیەدا دەردەکەوێت،نموونە:




﴿ أَكْثَرَهُمْ ﴾ الطور: ٤٧.

# شێوەو وێنەی دەم بە دەربڕینی پیتی قەڵەو بە هەر سێ جۆرە (حَرَكَة) جووڵەكانیانەوە

پیتـی بـزواو (متحـرك): دەردەچێـت بـە دووركەوتنـەوەی نێـوان دوو ئەندامـی دەربڕینـدا لـە گـەڵ دەرچوونـی بنچینـەی جووڵەی پیتـە قەڵەوەكە نموونە :



﴿قَالَ﴾ لـە دوای دەرچوونـی پیتـی (قـاف) لـە شـوێنی دەرچوونی شـێوەی زمان وەك لە وێنەكـەدا دەردەكەوێت لە دەربڕینی (فتحة) هەمان وێنەی (ألف) دەردەكەوێت.



نموونە :

﴿يَقُولُ﴾ لـە دوای دەرچوونـی پیتـی (قـاف) لـە شـوێنی دەرچوونی شـێوەی زمان وەك ئـەم وێنەیـە دەردەكەوێت لە دەربڕینی (ضمة) هەمان وێنەی پیتی (واو)ـە.



نموونە :

﴿قِيلَ﴾ هەمان وێنەی (یـــاء)ـی (اللین)ـە.

## پیتەکانی زمانی عەرەبی

**بـەرزی**

( خُصَّ ضَغْطٍ قِظْ )

**قەڵـەوی بـەردەوام**

**نـزمی**

ئەو پیتانەی ماونەتەوە

**لە هەندێ کاتدا قەڵەون**

(راء ، لام ، الف)

**بـەردەوام ناسکن**

ئەو پیتانەی ماونەتەوە
کە نزمە

# حوکمی یەکەم

## حالەتەکانی خوێندنەوەی پیتی (راء) بەقەڵەوی

- رَ — أَرَءَيْتَ
- ـــَـ رْ — أَنذَرْنَٰكُمْ
- ـُـْـرْ — صُفْرٌ
- توش هاتوو ـــِـا رْ — إِنِ ٱرْتَبْتُمْ
- ـَـ ـْـ رْ — ٱلْفَجْرِ
- ـُـ رْ — ٱلْقُرْءَانَ
- رُ — رُزِقُوا۟
- ـِـرْ (ص بەرزی) — مِرْصَادًا

١- ئەگەر پیتی (راء، فتحة) ی لە سەر بوو.

**نموونە:**

﴿أَرَءَيْتَ﴾ الماعون: ١، ﴿زَجْرَةٌ﴾ النازعات: ١٣.

٢- ئەگەر پیتی (راء) ساکن بوو وەپێشەکەی ساکنێکی جگە لە پیتی (یاء) بوو پێش ئەویش (فتحة) بوو.

**نموونە:**

﴿وَٱلْفَجْرِ﴾ الفجر: ١، ﴿وَٱلْعَصْرِ﴾ العصر: ١، ﴿كَٱلْقَصْرِ﴾ المرسلات: ٣٢.

٣- ئەگەر پیتی (راء) ساکن بوو. پێشی (فتحة) بوو.

نموونە:

﴿قَرْنٍ﴾ الأنعام: ٦، ﴿مَرْجِعُهُمْ﴾ الأنعام: ١٠٨.

٤- ئەگەر پیتی (راء) ساکن بوو پێشەکەی (ضمة) بوو.

نموونە :

﴿مُرْسَىٰهَا﴾ النازعات: ٤٢.

٥- ئەگەر پیتی (راء) (ضمة) بوو.

نموونە:

﴿ٱلرُّوحُ﴾ النبأ: ٣٨.

٦- ئەگەر پیتی (راء) ساکن بوو پیتەکەی پێشیشی ساکن بوو پێش ئەویش (ضمة) بوو.

نموونە:

﴿صُفْرٌ﴾ المرسلات: ٣٣.

٧- ئەگەر پیتی (راء) ساکن بوو پێشەکەی (کسرة) بوو دوای خۆشی پیتێکی بەرزی لە دوادا بێت، بەڵام پیتە بەرزەکە ( کسرة ) نەبێت بەڵکو (فتحة) بێت، ئەمەش تەنها لە پێنج شوێندا هاتووە لە قورئانی پیرۆز:

| قِرْطَاسٍ | وَإِرْصَادًا | فِرْقَةٍ | مِرْصَادًا | لَبِٱلْمِرْصَادِ |
|---|---|---|---|---|
| الأنعام: ٧ | التوبة: ١٠٧ | التوبة: ١٢٢ | النبأ: ٢١ | الفجر: ١٤ |

٨- ئەگەر پیتی (راء) ساکن بوو پێشەکەشی (کسرة) بنەڕەتی (أصلی) نەبوو بەڵکو توشهاتوو (عارض) بوو.

نموونە:

﴿إِنِ ٱرْتَبْتُمْ﴾ المائدة : ١٠٦، ﴿إِلَّا مَنِ ٱرْتَضَىٰ﴾ الجن : ٢٧.

## شێوە و وێنەی زمان لە دەربڕینی پیتی (راء)ی قەڵەو



لە گەڵ پیتی (راء)ی قەڵەو ناوەڕاستی زمان چاڵ دەبێت و تەنگیەك لە قوڕگ دروست دەبێت.

نموونە :

﴿هُوَ ٱلْبَرُّ ٱلرَّحِيمُ﴾ الطور: ٢٨.

## حوكمی دووەم

# جۆرەكانی خوێندنەوەی پیتی (راء) بە (لاواز) ناسك

| ر | ـِ رْ | ـِ ـْ رْ | يـ رْ |
| --- | --- | --- | --- |
| رِزْقًا | فَٱغْفِرْ لَنَا | ٱلسِّحْرَ | قَدِيرٌ |

١- ئەگەر پیتی ( راء - مكسور) كەسرەدار بێت.

نموونە:

﴿ رِزْقًا ﴾ البقرة: ٢٢، ﴿ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴾ الفلق : ٥.

٢- ئەگەر پیتی (راء) ساكن بێت پێشەكەی (كسرة) بنەڕەتی (أصلي) بێت.

نموونە :

﴿ فَٱغْفِرْ لَنَا ﴾ آل عمران: ١٦، ﴿ فِرْعَوْنَ ﴾ النازعات: ١٧،

﴿ وَٱسْتَغْفِرْهُ ﴾ النصر: ٣، ﴿ فَبَشِّرْهُم ﴾ الانشقاق : ٢٤.

٣- ئەگەر پیتی (راء) ساكن بێت وە پێشەكەی پیتی (ساكن)ی نا بەرز (لاواز) بێت، وەپێش پیتە لاوازەكەی (كسرة) بێت.

نموونە :

﴿ ٱلسِّحْرَ ﴾ البقرة:١٠٢، ﴿ لِّذِى حِجْرٍ ﴾ الفجر:٥، ﴿ ٱلذِّكْرِ ﴾ ص:١.

٤- ئەگەر پیتی (راء) ساکن بێت وە لە پێشی دا ( یاء )ێکی (ساکن) هەبێت.

نموونە:

﴿خَيْرٌ﴾ النحل: ٣٠، ﴿قَدِيرٌ﴾ الملك: ١، ﴿ٱلسَّعِيرِ﴾ الملك: ١١.

## شێوە و وێنەی زمان لە دەربڕینی پیتی ( راء )ی لاواز (ناسک )



لەگەڵ پیتی (راء)ی لاواز (ناسك) ناوەڕاستی زمان چاڵ نابێت وهیچ تەنگیەك لە قوڕگ دروست نابێت بە پێچەوانەی پیتی (راء)ی قەڵەو.

نموونە :

﴿ٱلرِّبَوٰاْ﴾ النساء: ١٦١.

# حوكمی سێ یەم

## جۆرەكانی خوێندنەوەی پیتی ( راء ) بەهەردوو شێواز (جواز الوجهين)

مِصْرَ — فِرْقٍ — ٱلْقِطْرِ — يَسْرِ — وَنُذُرِ

**پیتی ( راء ) لەم شوێنانەی خوارەوە دروستە بە هەردوو شێواز بخوێندرێت لە كاتی وەستان لەسەری:**

١- وشـەی: (مِصْرَ)[١٣] *: لە چوار شـوێن هاتووە لە قورئانی پیرۆز، زانایان باسی ئەم وشەیان كردووە، كە دروستە قورئان خوێن بە هەردوو شێواز بیخوێنێت لە كاتی وەستان لە سەری، جا بە قەڵەوی بێ یان بە لاوازی، بەڵام چاكتر وایە بە قەڵەوی بخوێندرێت،چونكە لە كاتی ڕۆیشـتن بە سەر پیتی (راء) لە وشەی:(مِصْرَ)بە قەڵەوی دەخوێندرێتەوە :

- ﴿ أَن تَبَوَّءَا لِقَوْمِكُمَا بِمِصْرَ بُيُوتًا ﴾ يونس: ٨٧.
- ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِى ٱشْتَرَىٰهُ مِن مِّصْرَ لِٱمْرَأَتِهِۦٓ أَكْرِمِى ﴾ يوسف: ٢١.
- ﴿ وَقَالَ ٱدْخُلُوا۟ مِصْرَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ ﴾ يوسف: ٩٩.
- ﴿ قَالَ يَـٰقَوْمِ أَلَيْسَ لِى مُلْكُ مِصْرَ ﴾ الزخرف: ٥١.

---

١٣) جگە لەم جۆرە : ﴿مِصْرًا﴾ البقرة: ٦١.

٢- وشـەی: (فِرْقٍ)* لـە یەك شـوێن هاتـووە لە قورئانی پیـرۆز، کە پیتی (قاف)ـەکە تەنوینی (کسرة) لەژێرە، وەك (ابن الجزري) رەحمەتی خوای لـێ بـی دەفەرمـوێ : ( وَالْخُلْفُ فِي فِرْقٍ لِكَسْرٍ يُوجَدُ ) ، ئـەم وشـەیە پێویسـتە قورئانخوێن شـارەزا بێت لەشێوەی خوێندنەوەی: واتە وشەی (فِرْقٍ ) لە کاتی وەستان بە قەڵەوی دەخوێندرێتەوە، چونکە پیتی (قاف)ـەکە دەبێت بە (سـکون)، بەڵام لە کاتی ڕۆیشـتن بە لاواز (ناسـك)ی و (قەڵەو)ی دەخوێندرێتەوە، چونکە پیتی (قاف)ـەکە تەنوین (کسرة) یە.

٣- وشـەی: (ٱلْقِطْرِ)لە یەك شـوێن هاتووە لە قورئانی پیرۆز، کە دروسـتە پیتـی (راء) لـە کاتـی وەسـتان لـە سـەری بـە لاوازی یان بـە قەڵەوی بخوێندرێت، بەڵام زانایان دەفەرموون چاکتر وایە بەلاوازی بخوێندرێت چونکە لە کاتی ڕۆیشتن بە سەر پیتی (راء) لە وشەی (ٱلْقِطْرِ)بە لاوازی دەخوێندرێتەوە .

- ﴿ وَأَسَلْنَا لَهُۥ عَيْنَ ٱلْقِطْرِ ﴾ سبأ: ١٢.

٤- وشـەی: ﴿يَسْرِ﴾[١٤] الفجر: ٤، ئەگـەر هاتـوو (سـاکن) بـوو لە کاتی وەسـتان، وە لە پاشـی پیتی (یاء)ـی سـڕاوە هاتبێت کە لە بنەڕەتدا بەم شـێوەیەیە : ﴿يَسْرِى﴾ کـە دروسـتە پیتـی (راء) لە کاتی وەسـتان لە سـەری بە لاوازی یـان بـە قەڵـەوی بخوێندرێت، بـەڵام زانایـان دەفەرموون چاکتـر وایە بە لاوازی بخوێندرێت، چونکە لە کاتی ڕۆیشتن بە سەر پیتی (راء) لە وشەی : ﴿يَسْرِ﴾ بە لاوازی دەخوێندرێتەوە. وەکو: ﴿ وَٱلَّيْلِ إِذَا يَسْرِ ﴾ الفجر: ٤، لەقورئانی پیرۆزلەسێ جێگاوشوێن بە:﴿ فَأَسْرِ ﴾ هاتووە.

**نموونە:**

- ﴿ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ ٱلَّيْلِ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ ﴾ هود: ٨١.

---

١٤) بروانە (المنیر في أحکام التجوید) لاپەرە: ١٥٤، علم التجوید المستوی الثاني) لاپەرە: ١٢٠.

- ﴿ فَأَسۡرِ بِأَهۡلِكَ بِقِطۡعٖ مِّنَ ٱلَّيۡلِ وَٱتَّبِعۡ أَدۡبَٰرَهُمۡ ﴾ الحجر: ٦٥.
- ﴿ فَأَسۡرِ بِعِبَادِي لَيۡلًا ﴾ الدخان: ٢٣.

لەقورئانی پیرۆز لە دوو جێگاو شوێن بە:﴿ أَنۡ أَسۡرِ ﴾هاتووە.

نموونە:

- ﴿ أَنۡ أَسۡرِ بِعِبَادِي ﴾ طه: ٧٧.
- ﴿ أَنۡ أَسۡرِ بِعِبَادِيٓ إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴾ الشعراء: ٥٢.

٥- وشـەی : ﴿ وَنُذُرِ ﴾ القمر:١٦ ، ئەگەر هاتوو (ساكن) بوو لە كاتی وەستان، وە پاشی پیتی ( ياء )ـی سڕاوە هاتبێت كە لە بنەڕەتدا بەم شێوەیەیە : ﴿ وَنُذُرِي ﴾، ئەمەش لە شەش شوێن لە سوڕەتی (القمر) دا هاتووە لە ئایەتەكانی: (١٦ — ١٨ — ٢١ — ٣٠ — ٣٧ - ٣٩)، كە دروستە پیتی (راء) لە كاتی وەستان لە سەری بە لاوازی یان بە قەڵەوی بخوێندرێت، بەڵام زانایان دەفەرموون چاكتر وایە بە لاوازی بخوێندرێت، چونكە لە كاتی ڕۆیشتن بە سەر پیتی (راء) لە وشەی: ﴿ وَنُذُرِ ﴾ بە لاوازی دەخوێندرێتەوە.

شێخ (الغوثاني) دەفەرموێ : ڕاجیایی زۆر هەیە لە نێوان زانایانی ( تجويد )ـی سەردەم لەسەر ئاسایی بوونی هەردوو شێوە ( قەڵەوكردن و لاواز - ناسك - كردن ) لە وشەی: (يَسۡرِ — وَنُذُرِ)، وە هەر لایەنێك شێوازێك هەڵدەبژێرێت و ئەوەی تر ڕەتدەكاتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم مەسەلەیە (بابەتە) زۆر لەوە ئاسان ترە، چونكە (ابن الجزري) و (المتولي) ڕەحمەتی خوایان لێ بێ دەڵێن وا باشترە كە ناسك بكرێت لە هەردوو وشەكە[١٥].

---

١٥) سەیری (النشر:٢/١١١) وە ( غنية المقري المتولي ) لاپەرە: ٤٨. وە (هدايه القارئ: ١٣٥) وە (الفوائد التجويدية في شرح المقدمة الجزرية) : لاپەرە: ٦٤.

# حوكمەكانی پیتی (لام) لە ناوی خوای گەورە

(لام لفظ الجلالة)

یەكەم: قەڵەو

دووەم: ناسک

## حوکمەکانی پیتی (لام) لە ناوی خوای (لام لفظ الجلالة)

قەڵەو | ناسک

لامی وشەی (الله) بە قەڵەوی دەخوێندرێتەوە لەم حاڵەتانەی خوارەوە:

١- ئەگەر پیتی پێش وشەی (الله ، فتحة) بێت.

نموونە: ﴿أَلَمْ يَعْلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ﴾ العلق: ١٤.

٢- ئەگەر پێش وشەی (الله) پیتێکی (ساکن) بێت، پێشی (ساکن)ـەکەش (فتحة) بێت.

نموونە: ﴿وَٱتَّقُواْ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِ﴾ البقرة: ٢٨١.

٣- ئەگەر پیتی پێش وشەی (الله) (ضمة) بێت.

نموونە: ﴿وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبْدُ ٱللَّهِ﴾ الجن: ١٩.

٤- ئەگەر پێش وشەی (الله) پیتێکی (ساکن) بێت وە لە پێش پیتە (ساکن)ـە کەش (ضمة) بێت.

نموونە: ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ﴾ الأنعام: ٩١.

# شێوە و وێنەی زمان لە دەربڕینی پیتی (لام)ی قەڵەو



لە گەڵ پیتی (لام)ی قەڵەو ناوەڕاستی زمان چاڵ دەبێت وتەنگیەك لە قوڕگ دروست دەبێت .

پیتی( لام ) تەنها لە لامی (لفظ الجلالة) بە قەڵەوی دەخوێندرێتەوە (فتحة) یان (ضمة)ی لە پێش هاتبێت.

هەروەکو ئیمامی (ابن الجزري) ڕەحمەتی خوای لێ بی دەفەرموێ :

وَفَخِّمِ اللاَّمَ مِنِ اسْمِ اللَّه عَنْ فَتْحٍ أوْ ضَمٍّ كَعَبْدُ اللَّهِ

نموونە: ﴿عَبۡدُ ٱللَّهِ﴾ مريم: ٣٠، ﴿وَٱللَّهُ﴾ المجادلة: ٦.

# لامی وشەی (اللە) بە ناسکی دەخوێندرێتەوە لەم حاڵەتانەی خوارەوە:

١- ئەگەر لامی یەکەمی وشەی (اللە ، کسرة) بوو.

نموونە : ﴿لِلَّهِ﴾.

٢- ئەگەر لە پێش وشەی (اللە ، کسرة) بێت.

نموونە : ﴿فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا﴾ النصر: ٢.

٣- ئەگەر لە پێش وشەی (اللە ، کسرة) یەکی (عارض) تووش هاتوو بێت.

نموونە : ﴿قَوۡمًا ٱللَّهُ﴾ الأعراف ١٦٤، بە ﴿قومَنِ اللّه﴾ دەخوێندرێتەوە.

٤- ئەگەر لە پێش وشەی (اللە ، ساکن) بێت وە لە پێش پیتە (ساکن)ـە کەش کەسرە بێت.

نموونە: ﴿وَيُنَجِّي ٱللَّهُ﴾ الزمر: ٦١.

# شێوە و وێنەی زمان لە دەربڕینی پیتی (لام)ی باریک (ناسک)



لەگەڵ پیتی (لام)ی باریك (**ناسك**) ناوەڕاستی زمان چاڵ نابێت وهیچ تەنگیەك لە قوڕگ دروست نابێت

بە پێچەوانەی پیتی (لام)ی قەڵەو.

نموونەی پیتی (لام) خوێندنەوەی بە ناسکی: ﴿لِلَّهِ﴾ الرعد: ٣٣.

# حوكمی (ألِــف)

پیتی (ألف) وەکو پیتەکانی پێش خۆیەتی لە ڕووی سیفەتی بەرزی (الإستعلاء) یان نزمی (الإستفال).

١ – پیتی (ألف) بە قەڵەوی دەخوێندرێتەوە ئەگەر لە دوای پیتی بەرزی بێت کە بریتین لە حەوت پیت ( خُصَّ ضَغطٍ قِظ ).

نموونە:

| پیت | نموونـه | سورەت |
|---|---|---|
| خ + اِلف | خَاسِرَةٌ | (١٢) النازعات |
| ص + اِلف | ٱلصَّآخَّةُ | (٣٣) عبس |
| ض + اِلف | ٱلضَّآلِّينَ | (٧) الفاتحة |
| غ + اِلف | بِغَٰفِلٍ | (٧٤) البقرة |
| ط + اِلف | ٱلطَّآمَّةُ | (٣٤) النازعات |
| ق + اِلف | مَقَامَ رَبِّهِۦ | (٤٠) النازعات |
| ظ + اِلف | ٱلظَّٰلِمُونَ | (٤٢) ابراهيم |

# شێوه و وێنەی زمان له دەربڕینی پیتی (ألف)ی قەڵەو



لەگەڵ پیتی (ألف)ی قەڵەو ناوەڕاستی زمان چاڵ دەبێت وتەنگیەك له قوڕگ دروست دەبێت .

نموونەی (ألف)ی قەڵەو: ﴿ٱلطَّآمَّةُ﴾ النازعات: ٣٤، ﴿ٱلصَّآخَّةُ﴾ عبس: ٣٣.

٢- پیتی (أَلِف) بە لاواز دەخوێندرێتەوە ئەگەر لە دوای پیتی نزمی (الإستفال) هات ئەمە جگە لە پیتەکانی بەرزی (الإستعلاء)[١٦].

نموونە :

| پیت | نموونە | سورەت |
| --- | --- | --- |
| م + الِف | بِمَا تَعۡمَلُونَ | (٢) التغابن |
| ذ + الِف | بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ | (٤) التغابن |
| ب + الِف | وَبَالَ أَمۡرِهِمۡ | (٥) التغابن |
| ك + الِف | كَانَت تَّأۡتِيهِمۡ | (٦) التغابن |
| ح + الِف | فَحَاسَبۡنَٰهَا | (٨) الطلاق |
| ء + الِف | ءَامَنُواْ | (١١) التحريم |
| ن + الِف | فَنَفَخۡنَا | (١٢) التحريم |
| ت + الِف | كَانَتَا | (١٠) التحريم |

١٦) أ.هەروەکو لە پێشتر ئاماژەمان بە پیتی (راء) کرد سیفەتی قەڵەوی و ناسك وەردەگرێت، واتە لەو شوێنانە پیتی (راء) قەڵەو بوو کە پیتی (أَلِف) بە دواوە هات ئەوە (أَلِف)یش بە قەڵەو دەخوێندرێتەوە.

ب. بە هەمان شێوە لامی (لفظ الجلالة) لە کاتی خوێندنەوەی بە قەڵەوی (أَلِف)ی دوای بە قەڵەو دەخوێندرێتەوە.

# سیفەتە هاودژەکان

## پیتە داخراو و کراوەکان

## پیتەکانی زمانی عەرەبی

## لە رووی گیربوونی دەنگ لە نێوان زمان و مەڵاشووی سەروو

چوارەم/أ- داخـران

لە زمانەوانیدا (الإطباق) :

پێوەنووسان.

لە زاراوەدا: گیربوونی دەنگ لە کاتی دەربڕینی پیتەکانی (الإطباق) لە نێوان زمان و مەڵاشووی سەروو، وەپیتەکانی بریتین یە لە: (صاد ، ضاد ، طاء ، ظاء) .

ب- کـرانەوە

لە زمانەوانیدا (الإنفتاح) :

کراوە.

لە زاراوەدا : دەنگ گیر نابێت لە کاتی دەربڕینی پیتەکانی (الإنفتاح) لە نێوان زمان و مەڵاشووی سەروو، وەپیتەکانی ئەو پیتانەن کە ماونەتەوە جگە لە پیتەکانی ( الإطباق ) .

# پیتی داخراو لە شێوەی گیر بوونی دەنگ

**ظــــاء:**

دەنگ گیـر دەبێت لە پیتی داخراو لە نێوان زمان و مەڵاشووی سەروو.



نموونە: ﴿ٱلظَّآنِّينَ﴾ الفتح: ٦.

﴿أَظۡفَرَكُمۡ﴾ الفتح: ٢٤.

**تێبینی/**

لە روانگەی سیفەتی پیتەکانی (الإطباق) پیتی (طاء) لە هەموویان بەهێزترە، پیتــی (ظــاء) لە هەموویان بێ هێزتــرە ( لاوازە )، مام ناوەندیش پیتەکانی (صاد ، ضاد)ن، هەموو پیتەکانی( الإطباق ) ســیفەتی (الإســتعلاء) یان هەیە، بەڵام هەموو پیتەکانی ( الإستعلاء ) سیفەتی ( الإطباق ) یان نیە.

# پیتی کراوە لە شێوەی دەنگ گیر بوون





بەرز و کراوە بۆ نموونە : قاف                نزم و کراوە بۆ نموونە : کاف

دەنگ گیـر نابێت لە پیتی کراوە لە نێوان زمان و مەڵاشووی سەروو.

# بەراودێک لە نێوان
# داخراو و کراوە و بەرز و نزمی (مستعل و مستفل)



**ظـــاء**

**پیتی بەرزی داخراو**

**نموونە:**

﴿ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ الأنبياء: ٢٩،

**قـاف**

**پیتی بەرزی کراوە**

**نموونە:**

﴿يَقۡذِفُ﴾ سبأ: ٤٨،

**کـاف**

**پیتی نزمی کراوە**

**نموونە:**

﴿يُدۡرِككُّمُ﴾ النساء: ٧٨.

# سیفەتە هاودژەکان

## پێنجەم/أ- زمان تیژی (زمان پاراوی) (الإذلاق):

**لە زمانەوانیدا :**

واتا زمان تیژی و پاراوی، وشەی (الاذلاق) بە تەنیا واتا دەورووبەری یاخود لێواری.

**لەزاراوەدا:**

خێرایی و ئاسانی دەربڕینی پیتەکە لە کاتی دەرچوونی لە دەوروبەری زمان و لێوەکان، و پیتەکانی زمان تیژی بریتی یە لە ( فاء، راء، میم، نون، لام، باء ).

وەك (ابن الجزري) رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ:

. . . . . . . . . وَ( فَرَّ مِنْ لُبِّ ) : الحُرُوفُ المُذْلَقَهْ.

**هۆی ناونانی بەم ناوە :**

وای پێی دەوترێت چونکە بە ئاسانی و خێرایی لە لێواری زمان دەردەچێت وەك ( لام، نون، راء ) و هەندێکیان لە لێواری لێوەکان دەردەچێت وەك ( باء، فاء، میم ) بۆیە دەبێ ئاگاداربین لە کاتی دەربڕینی چونکە لەوانەیە بەشێك لە پیتەکە یاخود لە جووڵە (حرکة)ی پیتەکە بزربێت.

## ب- الإصمات (قەدەغەبوون – بێ دەنگ بوون):

**لە زمانەوانیدا:** قەدەغەبوون یاخود بێ دەنگ بوون لە قسەکردن هاتووە .
**لەزاراوەدا:** واتا گرانی پیتەکە بە جۆرێك کە بە قورسی لە دەم دەردەچێت، چونکە دوور لە لێواری زمان دەردەچێت یان لەبەرئەوەیە کە قەدەغەیە لە زمانی عەرەبی دا ئەو وشانەی لە (٣) سێ پیت زیاتر پێکهاتوون، هەموو پیتەکانیان پیتی (إصمات) قەدەغەبوون بن، بۆیە هەر وشەیەکی لەم جۆرە، دەبێ پیتێك یان زیاتر لە پیتەکانی (إذلاق) زمان تیژی تێدابێت بۆ ئەوەی هاوسەنگی لە وشەکەدا دروست بێت، چونکە ئەگەر هەموو پیتەکانی پیتی (إصمات) بن ئەوە بە گرانی دەردەبڕدرێت .

لەبەرئەوە ئەگەر هاتوو وشەیەکت بینی کە بنچینەکەی لە چوار یان پێنج پیت پێك هاتبوو و هەمووی پیتی (قەدەغەبوون) بوو ئەوا ئەو وشەیە وشەیەکی بیانی یە وەك: (إسحاق )، چونکە عەرەب حەز بە ئاسان دەربڕینی پیتەکان دەکەن بەڵام بۆ ئەو وشانەی کە لە سێ پیت پێك هاتوون ئاسایی یە هەمووی پیتی قەدەغەکراو بێت چونکە لەزمانی عەرەبی هەیە، ئەو پیتانەی قەدەغەن بریتین لە هەموو پیتەکانی زمانی عەرەبی جگە لە پیتەکانی زمان تیژی، هەندێ لە زانایان ئەم دوو سیفەتەیان (زمان تیژی، قەدەغەبوون) ئەژمار نەکردووە هەروەکو ئیمامی (شاطبي) کە پێی وایە هیچ کاریگەری لەسەر (دەنگ) نیە لە کاتی خوێندنەوە بەڵکو وای داناوە کە بەشێك بێت لە زانستی (صرف).

# ئەو سیفەتانەی دژیان نی یە

**یەکەم//** فیـکە ( الصفیر ).

له زمانەوانیدا : دەنگێکە لە دەنگی باڵندە دەچێت ٠

له زاراوەدا : بریتیە لە تیژی دەنگی پیت، لەوەوە دروست دەبێت کە پیتەکە بە شوێنێکی تەنگدا دەڕوات.

پیتەکانیشی ئەمانەن: ( صـــاد، زاي، سین )

(ابـن الجــزري) ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ:

( صَفِيرُها صادٌ وزايٌ سِينُ .................. )




نموونە :

﴿ وَٱلَّذِينَ يُمَسِّكُونَ بِٱلْكِتَٰبِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ الأعراف : ١٧٠،

﴿ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِ ﴾ النور : ٣٧.

## تێبینی /

له ڕوانگەی سیفەتی پیتەکانی (الصفیر) پیتی (صاد) له هەموویان بەهێزترە، چونکـه سـیفەتی (الإسـتعلاء والاطباق)ـی هەیه پیتی (سـین) لـه هەموویان (لاواز) بێ هێزترە، وه پیتی ( زاي ) مام ناوەندیه، چونکه سیفەتی (الجهر)ـی هەیه.

## دووەم / لەرینەوە (القلقلة)

له زمانەوانیدا : (هەژان) و (لەرینەوە) و (جووڵە).

عەرەب دەڵێن : مەنجەڵەکە لە سەر ئاگر دەستی کرد بە جووڵە جوول.



لەرینەوە لە زاراوەدا : بریتیە لە دەرچوونی پیتی هەژان (القلقلة) لە باری زەنەدار (ساکن) بە دوور کەوتنەوەی نێوان هەردوو ئەندامی دەربڕین بە بێ ئەوەی هیچ جووڵەیەکی لە گەڵدا بێ لە سێ جۆرەکان (ضمة، کسرة، فتحة)، وەپیتەکانی پێنچ پیتن کۆ کراونەتەوە لە وشەی: ( قُطُب جَد).

وەك (ابن الجزري) رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ:

( ..................... قَلْقَلَةٌ : ( قُطْبُ جَدٍّ) ..................... )



(باء)ی هەژانی زەنەدار (ساکن) دەردەچێت بە دوورکەوتنەوەی دوو لێوەکان بەبێ دوورکەوتنەوەی شەویلگەی سەروو و خواروو.

# بەراوردێک لە نێوان

# پیتی (ساکن) و (القلقلة) و (متحرك)



(بـــاء)ــی تـێـك هـەڵـكـێـشـراوی زەنــەدار (ساكن) بێ هەژان و جووڵاو دەردەچێت بە پێك كەوتنی دوو لێوەكان.

نموونە : ﴿ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ﴾ البقرة: ٦٠.



(باء)ی هەژانی زەنەدار (ساكن) دەردەچێت بـە دووركەوتنـەوەی دوو لێـوەكان بە بێ دووركەوتنـەوەی شـەویلاكی سـەرەروو خواروو .

نموونە : ﴿أَمۡ حَسِبۡتَ﴾ الكهف: ٩.



(باء)ی جووڵاو و( فتحة) دەردەچێت بە دووركەوتنەوەی دوو لێوەكان و شەویلاكی سەروو خواروو.

نموونە: ﴿بَلَىٰ﴾ القيامة: ٤.

## هەژان (القلقلة) دابەش دەبێت بۆ سێ جۆر :

١- هەژانی بچووك ( القلقلة الصغری ): ئەم جۆرەیان لەو کاتە دەبێت کە پیتی هەژان (قلقلة) لەناوەراستی وشە بێت.

نموونە: ﴿قَبۡلَهُمۡ﴾ ق: ١٢.

بەڵام بۆنموونە ئەگەر لەسەر وشەی ﴿قَدۡ﴾ لە ﴿قَدۡ جَآءَكُمۡ﴾ المائدة: ١٥، وە لەسەر وشەی ﴿فَٱهۡبِطۡ﴾ لە ﴿قَالَ فَٱهۡبِطۡ مِنۡهَا﴾ الأعراف: ١٣، نەوەستاین وەگەیاندمان بە وشەی دوای خۆی، بەهەمان شێوە هەژانی بچووکە.

وەك (ابن الجزري) رەحمەتی خودای لێ بێت دەفەرموێ :

وَبَيِّنَنْ مُقَلْقَلاً إنْ سَكَنَا    وَإنْ يَكُنْ فِي الْوَقْفِ كَانَ أَبْيَنَا .

٢- هەژانی مامناوەندی (القلقلة الوسطی): ئەم جۆرەیان لەو کاتە دەبێت کە پیتی هەژان (قلقلة) لەکۆتایی وشەدا بێت و بوەستی لە سەری بەڵام پیتەکە شەدەدار نەبێت.

نموونە : ﴿أَمۡرٖ مَّرِيجٍ﴾ ق: ٥، ﴿مُّحِيطُۢ﴾ البروج: ٢٠.

٣- (القلقلة الكبرى) هەژانی گەورە : ئەم جۆرەیان لەو کاتە دەبێت کە پیتی هەژان (قلقلة) لە کۆتایی وشەدا بێت بوەستی لە سەری و شەدەدار بێت .

نموونە : ﴿وَتَبَّ﴾ المسد: ١، ﴿ٱلۡحَقُّ﴾ النبأ: ٣٩، ﴿ٱلۡحَجُّ﴾ البقرة: ١٩٧، ﴿أَشَدَّ﴾ البقرة: ٢٠٠.

# ئەو هەڵانەی روو دەدەن لە کاتی جێ بەجێ کردنی پیتەکانی هەژان (قلقلة) :

١- تێکەڵ کردنی دەنگی پیتەکە بە یەکێك لە سێ حەرەکەکان.

**نموونە:**

﴿لَقَدْكَانَ﴾ يوسف:٧، ﴿تُبْتُمْ﴾ البقرة:٧٩، ﴿رِجْسًا﴾ التوبة:١٢٥.

٢- کۆتایی هێنانی دەنگی پیتەکە بە هەمزە.

وەك : ﴿فَارْغَبْ﴾ الشرح: ٨، خوێندنەوەی بە هەڵە ﴿فَارْغَبْء﴾.

٤- درێژکردنەوەی دەنگی پیتەکە لە سنووری خۆی زیاتر.

وەك : ﴿أَحَدُ﴾ الاخلاص: ١، ﴿مُّحِيطُ﴾ البروج: ٢٠.

٥- بڕینی دەنگی پیتی (قلقلة) بۆ پیتی دوای خۆی.

وەك : ﴿يَقْضِي﴾ يونس: ٩٣، ﴿يَدْخُلُونَ﴾ النساء: ١٢.

# جیاوازی نێوان زەنەدار (ساکن) و هەژان و بزواو

| پیتەکە لە چ بارێکە؟ | چۆنیەتی دەرچوونی | بە دەرچوون لە گەڵی |
|---|---|---|
| زەنەدار (ساکن) | بە لێکدان و بەریەك کەوتنی دوو ئەندامی دەربڕین | هیچ شتێکی بزواو لە گەڵی دەرناچێت |
| هەژان (القلقلة) | بە دوور کەوتنەوەی دوو ئەندامی دەربڕین | هیچ شتێکی بزواو لە گەڵی دەرناچێت |
| بزواوێك (حرکة) | بە دوور کەوتنەوەی دوو ئەندامی دەربڕین | حەرەکەیەك (بزواندنێك) |

**سێیەم/ نـەرمی (اللیـن) :**

**لە زمانەوانیدا :** نەرم و نیان.

**لە زاراوەدا :** بریتیە لەو سـیفەتەی کە دەچێتە سـەر (واو) (یـــاء)ـی نەرم کەخۆیان (ساکن)بن لە پێشیانە وە (فتحة) هاتبێت، بە هۆی ڕۆیشتنیان لە شوێنی دەرچوونیان بەئاسانی ونەرم و نیانی ناونراوە بە (اللین).

وەك (ابن الجزري) ڕەحمەتی خودای لێ بێت دەفەرموێ:

وَاللِّينُ ..........................

وَاوٌ وَيَاءٌ سُكِّنَا ، وَانْفَتَحَا قَبْلَهُمَا.........................

**نموونە :**

﴿قَوۡمُ﴾ القمر: ٣٣، ﴿قُرَيۡشٍ﴾ قريش: ١، ﴿ٱلۡبَيۡتِ﴾ قريش: ٣.

## تێبینی /

١- پیتی (واو) و (یـــاء)ی نەرم (اللین) نابێت بە قەڵەوی بخوێندرێتەوە، بە هۆی هاتنی لە تەنیشت پیتی قەڵەو.

**نموونە :**

﴿وَقَوۡلِهِمۡ﴾ النساء : ٣٤، ﴿خَيۡرًا﴾ الكهف : ٣٦.

٢- نابێـت (یـاء) شـوێنی دەرچوونی بشـاردرێتەوە بە هۆی هاتنی (کسـرە) لەپێشی.

**نموونە :**

﴿لِيَعۡلَمَ﴾ المائدة: ٩٤، ﴿لِيُوَفِّيَهُمۡ﴾ فاطر: ٣٠.

پێویستە جووڵە بە زمان و لێوەکان بکرێ لە (واو) و (یاء)ی بزواو (متحرك).

## چوارەم/ لادان و لار بوونەوەی دەنگی پیتەکان (الإنحراف) :

لادان (الإنحراف) لە زمانەوانیدا : واتە : لادان و لاربوونەوە.

لە زاراوەدا : بریتیە لە لادانی دەنگی پیت لە بەر نەرۆیشتنی دەنگ بە تەواوی بەهۆی ڕێگری زمان لە ڕێگەیەوە کە پیتە کانی(لام) و (راء) لە خۆ دەگرێ.

# چەند تێبینی یەک دەربارەی پیتی (لام، راء) کە لە نێو پەرتووکەکانی (تجوید) باس دەکرێ

**بەچەند خاڵێکی کورت ئاماژە بە بۆچوونە جیاوازەکان دەکەین:**

- لادان(الإنحراف): سیفەتی (لازم)ـە و پەیوەستە بە پیتی (لام ، راء) کە لێیان جیا نابێتەوە[١٧].

هەروەك (ابن الجزري) رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ:

(.............. والانحرافُ صُحِّحا في اللامِ وَالرَّا.................)

- لادان لە پیتی (لام) لار دەبێتەوە بۆ ناوچەی پێشەوەی زمان (طرف اللسان)، ولەپیتی ( راء ) دا لار دەبێتەوە بۆ سەر پشتی زمان کەمێك بەرەو رووی دەرچەی (لام)[١٨] ئەوە بۆچوونی (مَكيّ و سِيبَوَيهِ) یە، بۆ تێکەڵ کردنی پیتی (راء) بە (لام) بە کەسێك دەوترێت کە زمانی ناتەواو بێت و پیتی (راء) بە (لام)دەرببرێت، بۆیە دەوترێت: (يَجْعله الأَلْثَغُ[١٩] لَاماً).

---

١٧) بروانە پەرتوکی: ( التبيين في أحكام تلاوة الكتاب المبين )، الشيخ عبداللطيف فايز، لاپەرە : ١٨٧ .

١٨) بروانە ئەو سەرچاوانە: (جداول أحكام التلاوة والتجويد/ مديحه صالح مهدى، لاپەرە: ١٥٤) ( علم التجويد الغوثاني، المستوى الثاني، لاپەرە : ١٠٩ — ١١٠ ) ( المنير في احكام التجويد، لاپەرە : ( ١٣٦ — ١٣٧ ).

١٩) (الأَلْثَغُ ) واتە زمان لاری.

- لادان (الإنحـراف) بۆیـه ناودەبـرێ بـه (لادان) چونکـه پیتەکانـی (لام، راء) لادەدەن له پاش دەرچوونیان له دەرچەی خۆیان بەرەو شوێنی دەرچەی پیتێکی تر[٢٠].
- لادان (الإنحـراف) لـه پیتـی (لام، راء)ـه بـەم شـێوەیه : پیتـی (لام) لار دەبێتـەوه بۆ پێشـەوەی زمان (طرف اللسـان) بۆ دەرچـەی پیتی (نون)، بەڵام پیتی (راء) لار دەبێتەوه بۆ سـەر پشـتی زمان بۆ دەرچەی پیتی (لام)[٢١]به بێ تێك هەڵكێشان (الادغام).
- هەندێـك لەزانایـان دەڵێن تەنها پیتـی (لام) لادان (الإنحراف)ـی هەیه، ئەمەش بۆچوون و رای (ابن الحاجب) و(الدَّانيِّ)یـه[٢٢]

---

٢٠) الجواهر المضيه على المقدمة الجزرية، لاپەرە:١٣٩.

٢١) دليل الترتيل، جمع وترتيب : محمد أمين عثمان، لاپەرە:١٣٠.

٢٢) الجواهر المضية على المقدمة الجزرية، لاپەرە:١٣٩.

# بۆچوونی پەسەند ( القول الراجح )

## لە لادانی پیتی ( لام، راء )*

### ڕێژەی لادان لە پیتەکانی ( لام ) و ( راء )

پیتەکانی (لام،راء) سیفەتی لادان یان هەیە، بەڵام پیتی (لام) لادانی زیاترە لە پیتی (راء)

### لادانی( لام ) و ( راء ) لەرووی ( دەنگ )ـەوە

هەردوو پیت سیفەتی لادان یان هەیە لە دەنگ ، دەنگ لە پیتی (لام) لە ناوەڕاستی زمان لادە دات بۆهەردوو لاتەنیشتی زمان، بەڵام لە پیتی (راء) دەنگ لە لاتەنیشتەکانی زمان لادە دات بۆ ناوەراستی

### لادانی( لام ) و ( راء ) لەرووی ( دەرچە ) وە

هەردوو پیت سیفەتی لادان یان هەیە لە شوێنی دەرچونیان، پیتی (لام) لادەدات بۆ پێشەوەی زمان (طرف اللسان) بۆ دەرچەی پیتی (نون)، بەڵام پیتی (راء) لادەدات بۆ سەر پشتی زمان کەمێک بۆ دەرچەی پیتی (لام) بەڵام بە بێ تێک هەڵکێشان

رای پەسەند و دروست بریتی یە لەوەی کە لادان تەنها لە (دەنگ)ی ئەم دوو پیتە روونادات بەڵکو لە دەرچە (مخرج )یش روودەدات[٢٣].

٢٣) بڕوانە ئەو سەرچاوانە :
- التجويد المصور، د.أيمن رشد سويد، لاپەرە ١٩٤ - ١٩٩ (کە ئێمە زیاتر سوودمان لەو سەر چاوەیە وەرگرتووە).
- تيسر الرحمن في تجويد القران، لاپەرە : ١٠٣.
- أحكام قراءة القران الكريم، تأليف الشيخ محمود خليل الحصري، لاپەرە ٧٣.
- دليل الترتيل، جمع وترتيب : محمد أمين عثمان، لاپەرە ١٣٠.
- المختصر الوافي من هداية القاريء الى تجويد كلام الباريء، لاپەرە ١٤٨.
- تعليم القاري، الشيخ محمد البارودي، لاپەرە ٧٦.

# لادانی دەنگی پیتی (لام)






دیمەنێکی روون و
بەرچاوی زمان لە کاتی
دەربڕینی پیتی (لام).

نموونە : ﴿أَنزَلْنَا﴾ الأنفال: ٤١.






لادانی دەنگی پیتی (لام)
دەبێت بۆ هەردوولای تەنیشتی زمان
سەرپشتی پێشەوەی زمان (طرف اللسان)
بە هۆی رێگری سەری زمان لە
دەرچوونی.



دیمەنێکی روون و
بەرچاوی زمان لە کاتی
دەربڕینی پیتی (راء).




نموونە : ﴿مُّسْتَقَرٌّ﴾ الأنعام: ٦٧.



لە پیتی (راء) بە پێچەوانەوە
دەنگ لە هەردوو لای تەنیشتەکانی
زمان لادەدا بۆ ناوەڕاستی پێشەوەی
سەری زمان.



# بەراوردێک لە نێوان لادانی دەنگی (لام) و (راء)



راء لام

**پێنجەم/** دووبارە بوونەوە (التكرير):

لە زمانەوانیدا : دووبارە بوونەوە.

لە زاراوەدا: بریتیە لە لەرانەوەی پێشەوەی سەرپشتی زمان (طرف اللسان) لە دەربڕینی پیتی (راء) بە لەرانەوەیەکی شاراوە لەئەنجامی تەنگی شوێنی دەرچوونی پیتی (راء)، پێویستە قورئان خوێن وریا بێت زیادەڕۆیی نەکات لە دووبارە بوونەوەی سەری زمان لە پێکەوتنی بە پوکو لە جارێك زیاتر کە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی زیاتر لە (راء)ـێك، ئەگەر سەیری سیفەتەکانی پیتی (لام ، راء) بکەین وەك یەکن تەنها بە سیفەتی (التكرير) لێك جیا دەکرێنەوە هەروەکو ئیمامی (ابن الجزري) رەحمەتی خوای لێ بی دەفەرمویٚ:

فِي اللَّامِ وَالرَّا وَبِتَكْرِيرٍ جُعِلْ ................... )

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| اللام | الجهر | التوسط | الإستفال | الإنفتاح | الإذلاق | الإنحراف | |
| الراء | الجهر | التوسط | الإستفال | الإنفتاح | الإذلاق | الإنحراف | التكرير |

## شەشەم/ بڵاوبوونەوە (التفشي):




**لە زمانەوانیدا :** بڵاوبوونەوە.

**لە زاراوەدا :** بریتیـه لە بڵاوبوونەوەی دەنگی (شیـن) لەشوێنی دەرچوونی تاکو بەرناوەوەی ددانەکانی سەروو و خواروو دەکەوێت.

**نموونە :** ﴿ٱلرُّشْدِ﴾ الجن: ٢.

( ابن الجزري ) رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ: : وَلِلتَّفَشِّي : الشِّيْنُ...............

## حەوتەم/ درێـژبـوونەوە (الإستطالة):

**لە زمانەوانیدا :** درێژبوونەوە.

**لە زاراوەدا :** بریتیــه لە پاڵ نانی زمان لە کاتی دەربڕینی پیتی (ضاد) لە کۆتایی دەمەوە تا پێشـەوەی دەم هەتا سـەری زمان دەنوسـێ بە رەگی دوو ددانی پێشـەوەی سـەروو ئەوەش لە ژێر کارتێکردنی ئەو هەوا پاڵنراوەیە کە لە لای دواوەی زمانەوە دێت.

**نموونە :** ﴿فَضْلِهِۦ﴾ الجاثية: ١٢، ﴿بَعْضٍ﴾ الجاثية: ١٩.





■ ناوچەی نووسانی زمان بە بێ پاڵە پەستۆ

■ ناوچەی نووسانی زمان لە کاتی فشار و پاڵ کەوتن

(ابن الجزري) رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ:

(...........ضَاداً : اسْتَطِلْ )

# مینگە لە كاتی بوونی بە سیفەت



(نـون)



(میـم)

**مینگـە :** بریتیـە لە سـیفەتی (نـون و میـم)ـی زەنەدار (سـاكن) و بزواو (متحرك) و لە هەر بارێك بێت ئاشكرا (الاظهار) یان تێكهەڵكێشراو (الادغام) یـان شـاراوە بـێ ( الاخفاء) بەڵام مـاوەی درێژكرنەوەیان جیـاوازە بە پێی كاتەكانیان.

نموونە : ﴿فَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمۡ زَادَتۡهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنٗا﴾ التوبة: ١٢٤.

| إظهار | إدغام | إظهار | متحرك |
|---|---|---|---|

نموونە : ﴿مَا مِن شَفِيعٍ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ إِذۡنِهِۦ﴾ يونس: ٣.

| إخفاء | إظهار | إقلاب | متحرك |
|---|---|---|---|


صفات الحروف
سيفەتی پیتەکان
لها ضد
دژ دارەکان
لا ضد لها
بێ دژ دارەکان
الجهر
ئاشكرا كردن
الهمس
چرپە
الشدة
توندی
البينية
مام ناوەند
الرخاوة
خاوی
الإستعلاء
بەرز كردن
الإستفال
نزم كردن
الإطباق
پێوە نووسان
الإنفتاح
كرانەوە
الإذلاق
تیژی
الإصمات
بێ دەنگی
الصفير
فيكە
القلقلة
هەژان
اللين
نەرم
الإنحراف
لادان
التكرير
دووبارە بونەوە
التفشي
بڵاوبوونەوە
الإستطالة
درێژبوونەوە

# دابەشكردنی سیفەتی پیتەكان لە شێوەی بەهێز و بێ هێز (لاواز)

| سیفەتی بەهێز | سیفەتی مام ناوەندی | سیفەتی بێ هێز (لاواز) |
| --- | --- | --- |

(١) سیفەتە بەهێزەكان : ژمارەیان ( دە ) سیفەتە[٢٤] :

١- الجهر ٢- الشدة ٣- الإستعلاء

٤- الإطباق ٥- الصفير ٦- القلقلة

٧- الإنحراف ٨- التكرير ٩- التفشي

١٠- الإستطالة

(٢) سیفەتی مام ناوەندی : ژمارەیان (سێ) سیفەتە :

١- الإذلاق ٢- الإصمات ٣- التوسط (البينة)

(٣) سیفەتی بێ هێز ( لاواز ) : ژمارەیان (پێنج) سیفەتە:

١- الهَمس ٢- الرَّخاوه

٣- الإستفال ٤- الإنفتاح

٥- اللين

٢٤) تێبینی: ١) زانایان سیفەتی (الغنة) یان لە بەهێزەكان ئەژمار كردووە.
٢) زانایان سیفەتی (الخفاء) یان لە لاوازەكان ئەژماركردووە.

# دابەشكردنی پیتەكان لە شێوەی بەهێز و بێ هێز (لاواز)




١- **بەهێزتریـن** : ئـەو پیتەیە كـە هەموو سـیفەتەكانی بەهێزن كە تەنها (یەك) پیتە لە زمانی عەرەبی : (طاء)

٢- **بەهێز** : ئەو پیتانەی كە سیفەتی بەهێزیان زیاترە لە سیفەتی بێ هێز (لاواز)، ژمارەی پیتەكان (هەشت)ـن:
(بـاء، جیم، دال، راء، صـاد، ضاد، ظاء، قاف)٠

٣- **مام ناوەندی** : ئەو پیتانەن كە سـیفەتەكانیان یەكسـانن لە ڕوانگەی بەهێزو بێ هێز ( لاواز )، ژمارەیان ( پێنـج ) پیتە :
(همـزة، غیـن، لام، میم، نون).

٤- **لاواز** : ئەو پیتانەن كە سـیفەتی لاوازیان زیاترە لە سـیفەتی بەهێز، ژمارەیان ( دە ) پیتە: ( تاء ، خاء ، ذال ، زاي ، سین ، شین ، عین ، كاف، واو ، یاء )ی نامـەددی (اللین).

٥- **لاوازتریـن** : ئـەو پیتانەن كە هەموو سـیفەتەكانیان لاوازن : ژمارەیان (چـــوار) پیتە : ( ثـــاء، حاء، فاء، هـاء )[٢٥] [*].

---

٢٥) (ألف، واو، یاء ) درێژكردنەوە: هەندێكیان ئەم سێ پیتەیان بە (لاواز) ئەژماركردووە، بڕوانە=

(الشَّيْخُ السَّمَنُودِيُّ) ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەفەرموێ :

قَوِيٌّ أَحْرُفِ الهِجَاءِ ضَادُ — بَا قَافُ جِيمٌ دَالُ ظَا رَا صَـــادُ

وَالطَّاءُ أَقْوَى والضَّعِيفُ سِينُ — ذَالٌ وَزاىٌ تَا وَعَيْنٌ شِـــينُ

كَذَاكَ حَرْفَا اللِّينِ خَـاءٌ كَافُهَا — وَالَمدُّ مَعْ (فَحَثَّهُ) أَضْعَفُهَـــا

وَالوَسْطُ هَمْزٌ غَيْنٌ مَعْ لامٍ أَتَتْ — وَالِميمِ وَالنُّونِ فَخَمْساً قُسِّمَتْ(٢٦)

(ابن الجزري) ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەفەرموێ:

صِفَاتُها : جَهْرٌ وَ رِخْوٌ مُسْتَفِلْ — مُنْفَتِحٌ مُصْمَتَةٌ : وَالضِّـــــدَّ قُلْ

مَهْمُوسُهَا : (فَحَثَّهُ شَخْصٌ سَكَـتْ) — شَدِيْدُهَا لَفْظُ : (أَجِدْ قَــطٍ بَكَتْ)

وَبَيْنَ رِخْوٍ والشَّدِيدِ: ( لِـنْ عُمَر ) — وَسَبْعُ عُلْوٍ:(خُصَّ ضَغْطٍ قِظْ)حَصَرْ

وَصَادُ ضَادٌ طَاءُ ظَاءٌ : مُطْبَقَـةْ — وَ( فرَّ مِنْ لُبِّ ): الحُرُوفُ الُمذْلَقَةْ

صَفِيرُهَـا / صَـــادٌ وَ زَايٌ سِـينُ — قَلْـقَلَةٌ : ( قُطْبُ جَـــدٍّ)وَاللِّينُ

وَاوٌ وَيَـاءٌ سُكِّنَـا، وَانْفَتَحَـــا — قَبْلَهُمَـــا ، وَالانْحِـــرَافُ صُحِّحَا

فِي اللاَّمِ وَالرَّا ، وَبِتَكْرِيرٍ جُعِـلْ — وَللتَّفَشِّي: الشِّيْنُ ضَاداً : اسْتَطِلْ

---

خشتەی= =پەرتووکی ( المنير في أحكام التجويد )، وە هەندێکیان بە مام ناوەند ئەژماریان کردووە بڕوانە خشتەی پەرتووکی (الدقائق المحكمات فى المخارج والصفات)، هشام عبدالبارى محمد راجح، لاپەرە: ( ١٤٨ ).

٢٦) ١- بڕوانە پەرتووکی: ( الدقائق المحكمات في المخارج والصفات )، هشام عبدالبارى محمد راجح : لاپەڕە ( ١٤٠ — ١٤١ ).
٢- بڕوانە پەرتووکی: ( الدرر البهية فى التعريفات التجويدية )، هشام عبدالبارى : لاپەڕە ( ٥٨ — ٥٩ ).

# خشتەی سیفەت و نازناو و پایەی پیتەکان[٢٧]

| پیتەکان | سیفەتەکان | | | | | | | نازناوی پیتەکان | پایەی پیتەکان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | | |
| الهمزة | الجهر | الشدة | الإستفال | الإنفتاح | الإصمات | | | حلقي | مام ناوەند |
| الباء | الجهر | الشدة | الإستفال | الإنفتاح | الإذلاق | القلقلة | | شفوي | بەهێز |
| التاء | الهمس | الشدة | الإستفال | الإنفتاح | الإصمات | | | نطعي | لاواز |
| الثاء | الهمس | الرخاوة | الإستفال | الإنفتاح | الإصمات | | | لثوي | لاوازترین |
| الجيم | الجهر | الشدة | الإستفال | الإنفتاح | الإصمات | القلقلة | | شجري | بەهێز |
| الحاء | الهمس | الرخاوة | الإستفال | الإنفتاح | الإصمات | | | حلقي | لاوازترین |
| الخاء | الهمس | الرخاوة | الإستعلاء | الإنفتاح | الإصمات | | | حلقي | لاواز |
| الدال | الجهر | الشدة | الإستفال | الإنفتاح | الإصمات | القلقلة | | نطعي | بەهێز |
| الذال | الجهر | الرخاوة | الإستفال | الإنفتاح | الإصمات | | | لثوي | لاواز |
| الراء | الجهر | توسط | الإستفال | الإنفتاح | الإذلاق | الإنحراف | التكرير | ذلقي | بەهێز |

---

٢٧) بۆ ئەم خشتەیە بڕوانە پەرتووکی: (الدقائق المحكمات فى المخارج والصفات)، هشام عبدالباری محمد، لاپەڕە : ( ١٤٥ — ١٤٦ — ١٤٧ — ١٤٨)، لە گەڵ پەرتووکی : (دليل الترتيل)، محمد أمين عثمان، لاپەڕە : (١٣٢ — ١٣٣)، و پەرتوکی: ( تيسير الرحمن فى تجويد القران )، لاپەڕە : ( ١١٣ — ١١٤ — ١١٥ ) و پەرتوکی: ( المنير فى أحكام التجويد )، لاپەڕە:( ١٤٢).

| | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| الزاي | الجهر | الرخاوة | الإستفال | الإنفتاح | الإصمات | الصفير | | أسلي | لاواز |
| السين | الهمس | الرخاوة | الإستفال | الإنفتاح | الإصمات | الصفير | | أسلي | لاواز |
| الشين | الهمس | الرخاوة | الإستفال | الإنفتاح | الإصمات | التفشي | | شجري | لاواز |
| الصاد | الهمس | الرخاوة | الإستعلاء | الإطباق | الاصمات | الصفير | | اسلي | بەهێز |
| الضاد | الجهر | الرخاوة | الإستعلاء | الإطباق | الاصمات | الإستطالة | | لا لقب له | بەهێز |
| الطاء | الجهر | الشدة | الإستعلاء | الإطباق | الاصمات | القلقلة | | نطعي | بەهێزترین |
| الظاء | الجهر | الرخاوة | الإستعلاء | الإطباق | الاصمات | | | لثوي | بەهێز |

| پیتەکان | سیفەتەکان | | | | | | نازناوی پیتەکان | پایەی پیتەکان |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | | |
| العين | الجهر | التوسط | الإستفال | الإنفتاح | الإصمات | | حلقي | لاواز |
| الغين | الجهر | الرخاوة | الإستعلاء | الإنفتاح | الإصمات | | حلقي | مام ناوەند |
| الفاء | الهمس | الرخاوة | الإستفال | الإنفتاح | الإذلاق | | شفوي | لاوازترین |
| القاف | الجهر | الشدة | الإستعلاء | الإنفتاح | الإصمات | القلقلة | لهوي | بەهێز |
| الكاف | الهمس | الشدة | الإستفال | الإنفتاح | الإصمات | | لهوي | لاواز |
| اللام | الجهر | التوسط | الإستفال | الإنفتاح | الإذلاق | الإنحراف | ذلقي | مام ناوەند |
| الميم | الجهر | التوسط | الإستفال | الإنفتاح | الإذلاق | | شفوي | مام ناوەند |

| | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| النون | الجهر | التوسط | الإستفال | الإنفتاح | الإذلاق | | ذلقي | مام ناوەند |
| الهاء | الهمس | الرخاوة | الإستفال | الإنفتاح | الإصمات | | حلقي | لاوازترین |
| (الف) مدّ (بۆشایی) | الجهر | الرخاوة | الإستفال | الإنفتاح | الإصمات | | جوفي | لاواز |
| (و، ي) مدّ (بۆشایی) | الجهر | الرخاوة | الإستفال | الإنفتاح | الإصمات | | جوفي | لاواز |
| (الواو) اللين | الجهر | الرخاوة | الإستفال | الإنفتاح | الإصمات | اللين | شفوي | لاواز |
| (ياء) اللين | الجهر | الرخاوة | الإستفال | الإنفتاح | الإصمات | اللين | شجري | لاواز |

## تێبینی/

❖ بۆیە پیتەکانی (مدّ و لین) بە سیفەتی (لاواز)مان هێناوە چونکە سیفەتی (الجهر)یان هەیە، بۆیە پیتەکانی (فاء، حاء، ثاء، هـاء) مان بە سیفەتی (لاوازترین) هێناوە، چونکە هیچ سیفەتێکی بەهێزیان نیە.

## بەشی سێیەم

# حوکمەکانی
# نونی ( ساکن ) و
# میمی ( ساکن ) و
# پلەکانی مینگە

# حوكمەكانی نونی ( ساكن ) و ( تەنوین )



**یەكەم:** دەرخـــستن (الإظهار)

**دووەم:** تێكهەڵكێشان (الإدغام)

**سێ یەم:** هەڵگەڕانەوە (القلب)

**چوارەم:** شـــاردنەوە (الإخـفاء)

# حوكمەكانی نونی (ساكن) و (تەنوین) (نْ، ـــًـــٍـــٌ)

هەر كاتێک نونی ساكن و تەنوین بگەن بەیەكێک لە (٢٨) پیتەكانی زمانی عەرەبی چوار جۆر حوكمیان هەیە

- **الإظهار**: ء، هـ، ع، ح، غ، خ
- **الإدغام**
  - ادغام بغنة: ن، م، و، ي
  - ادغام بلاغنة: ل، ر
- **القلب**: ب
- **الإخفاء**: ق ك، ش ج، ض ط، د ت، ص س، ز ظ، ذ ث، ف

## ڕوونكردنەوە/

١- (نون)ـی ساكن لە ناوەڕاست و كۆتایی وشە دێت بەڵام تەنوین تەنها لە كۆتایی دێت.

٢- نوونی ساكن پیتێكی سەربەخۆیە لە كاتی وەستان و گەیاندن دەمێنێ بەڵام تەنوین لە كاتی گەیاندن دەمێنێ وەلە كاتی وەستان لە سەر وشەكە نامێنێ.

٣- مینگە (غنــة) دەنگێكی مینگەدارە تەنها لە بۆشایی ناو لووت دەردەچێت وەئەم سیفەتە تەنها لە پیتی (نون، میم)ـدا بەدی دەكرێت.

# حوکمەکانی

## نونی(ساکن) و(تەنوین) نْ (ـٌ) (ـً) (ـٍ)

### یەکەم/ دەرخستن ( الإظهار )

له زمانەوانیدا: بریتیە لە ئاشکراکردن و دەرخستن.

لە زاراوەدا: بریتیە لە ئاشکرا کردن و خستنەرووی دەنگی (نْ)ی ساکن و تەنوین (ـٌ) (ـً) (ـٍ) بە مەرجێك یەکێ لە پیتەکانی (قورِگ)ی بە دوا دابێت کە بریتین لەم پیتانە: (الهمزه، الهاء، العین، الحاء، الغین، الخاء) کە لە سەرەتای ئەم وشانەدا کۆکراونەتەوە :

(أخي هاك علماً حازه غير خاسر).

ئاشکراکردن لە ((نْ))ی ساکندا لە یەك وشەداو لە نێوان دوو وشە روودەدات بەڵام لە تەنویندا (ـٌ) (ـً) (ـٍ) لە نێوان دوو وشە نەبێت روو نادات.

# خشتەی نموونەی پیتەکانی (الإظهار) :

| پیت | لەیەک وشەدا | لەدوو وشەدا | لە گەڵ تەنویندا |
|---|---|---|---|
| ء | ﴿وَيَنْـَٔوْنَ﴾<br>الأنعام : ٢٦ | ﴿مِنْ أَطْرَافِهَا﴾<br>الرعد : ٤١ | ﴿كُفُوًا أَحَدٌ﴾<br>الإخلاص : ٤ |
| هـ | ﴿ٱلْأَنْهَٰرُ﴾<br>البقرة : ٢٥ | ﴿فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ﴾<br>الرعد : ٣٣ | ﴿فَرِيقًا هَدَىٰ﴾<br>الأعراف : ٣٠ |
| ع | ﴿أَنْعَمْتَ﴾<br>الفاتحة : ٧ | ﴿وَمَنْ عِندَهُۥ﴾<br>الرعد : ٤٣ | ﴿سَلَٰمٌ عَلَيْكُم﴾<br>الرعد : ٢٤ |
| ح | ﴿وَتَنْحِتُونَ﴾<br>الشعراء: ١٤٩ | ﴿مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ﴾<br>الحجر: ٢٦ | ﴿وَٰسِعًا حَكِيمًا﴾<br>النساء: ١٣٠ |
| غ | ﴿فَسَيُنْغِضُونَ﴾<br>الإسراء: ٥١ | ﴿مِنْ غِسْلِينٍ﴾<br>الحاقة : ٣٦ | ﴿عَذَابٌ غَلِيظٌ﴾<br>إبراهيم : ١٧ |
| خ | ﴿وَٱلْمُنْخَنِقَةُ﴾<br>المائدة : ٣ | ﴿وَمِنْ خَلْفِهِۦ﴾<br>الرعد: ١١ | ﴿كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ﴾<br>إبراهيم : ٢٦ |

## دووەم/ تێکهەڵکێشان (الإدغـام)

لە زمانەوانیدا: واتە شتێك بخەیتە ناو شتێکی ترەوە.

لە زاراوەدا: بریتیە لە بە یەك گەیشتنی دوو پیت، یەکەمیان (ساکن) بێت دووەمیان بزواو (متحرك) بێت، بە شێوەیەك وەکو یەك پیتی توندو شەددە داری لێ بێت لە جۆری پیتی دووەم .

پیتەکانی تێکهەڵکـێشانیش ئەمانەن : (یاء، راء، میم، لام، واو، نون) کە لە وشەی (یرملون)دا کۆبۆتەوە، شێوەی (نونی ساکن) و (تەنوین) لە کاتی تێك هەڵکێشان لە قورئاندا بەم شێوەیە وێنەی کێشراوە :

( نْ ) ( ـٌـ ) ( ـً ) ( ـٍ )

(الإدغـام) تێکهەڵکێشان دوو جۆری هەیە:

١- (إدغام بغنـة) تێکهەڵکێشانی مینگەدار.

٢- (إدغام بلا غنـة) تێکهەڵکێشانی بێ مینگە.

### ١- (إدغام بغنـة) تێکهەڵکێشانی مینگەدار:

ئەم جۆرە پیتەکانی بریتین لە ( یاء، نون، میم، واو ).

## خشتەی نموونەی پیتەکانی (الإدغام) :

| پیت | لەگەڵ نونی ساکن | لەگەڵ تەنوین | جۆرەکەی |
|---|---|---|---|
| ن | ﴿فَلَن نَّزِيدَكُمْ﴾ النبأ : ٣٠ | ﴿أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ﴾ الإنسان : ٢ | تێکهەڵکێشانی تەواو |
| م | ﴿مِّن مَّسَدٍ﴾ المسد : ٥ | ﴿جَزَآءً مِّن رَّبِّكَ﴾ النبأ : ٣٦ | تێکهەڵکێشانی تەواو |
| و | ﴿مِن وَالٍ﴾ الرعد : ١١ | ﴿سِرَاجًا وَهَّاجًا﴾ النبأ: ١٣ | تێکهەڵکێشانی نا تەواو |
| ي | ﴿أَن يَخْسِفَ﴾ الملك : ١٦ | ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ﴾ المطففين : ١٠ | تێکهەڵکێشانی ناتەواو |

### ڕوونکردنەوە/

١- مەرجە تێکهەڵکێشکردن لە نێوان دوو وشە ڕوودات، لە قورئانی پیرۆز چوار وشە هەیە کە تێکهەڵکێش ناکرێن چونکە (نون)ـی ساکن لە گەڵ پیتی (الإدغام) لە ناو یەك وشەدا کۆبونەتەوە،

نموونە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| ﴿قِنْوَانٌ﴾ الأنعام : ٩٩ | ﴿صِنْوَانٌ﴾ الرعد : ٤ | ﴿بُنْيَٰنٌ﴾ الصف : ٤ | ﴿ٱلدُّنْيَا﴾ الأعلى: ١٦ |

٢- له سەرەتای سورەتی (یس) و سەرەتای سورەتی (القلم) تێکهەڵکێشان روونادات، پێویستە (نون)ی ساکن (الإظهار) ئاشکرا بکرێت لە ڕیوایەتی (حفص من طريق الشاطبية) .

﴿يسٓ ۝١ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡحَكِيمِ ۝٢﴾، ﴿نٓۚ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ ۝١﴾.

٣- تێکهەڵکێشان لە پیتی (نون، میم) (إدغام كامل)ـە تێکهەڵکێشانی تەواوە، ولە پیتی (واو، یاء) (إدغام ناقص) تێکهەڵکێشانی ناتەواوە، لەبەرئەوەش پێی دەوترێت تێکهەڵکشانی ناتەواو چونکە نیوەی دەنگ لە بۆشایی ناو لووت دەردەچێت، وەنیوەگەی تر لە دەمەوە دەردەچێت، واتە: تەنها سیفەتی (نون) دەمێنێ:

أ- لە پیتی(واو) لێوەکانی بەبازنەیی و گراوەیی بۆپێشەوە دەبێت بۆ شوێنی دەرچەی پیتی (واو)ی نەرم (اللين).

ب- لە پیتی (یاء) ناوەڕاستی زمان بەرز دەبێتەوە بۆ شوێنی دەرچەی پیتی (یاء)ی نەرم (اللين).

## ٢- (إدغام بلا غنـة) تێکهەڵکێشانی بێ مینگە.

ئەم جۆرەیان پیتـەکانی بریتین لە (لام ، راء)

## خشتەی نموونەی پیتەکانی (الإدغام بلا غنـة) :

| پیت | لە گەڵ نونی ساکن | لە گەڵ تەنوین | جۆرەکەی |
|---|---|---|---|
| لام | ﴿لَئِن لَّمْ يَنتَهِ﴾ العلق : ١٥ | ﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ﴾ المطففين : ١ | بێ مینگەی تەواو |
| راء | ﴿مِن رَّبِّكَ﴾ النبأ : ٣٦ | ﴿بَشَرًا رَّسُولًا﴾ الإسراء: ٩٤ | بێ مینگەی تەواو |

***تێبینی:***

تەنها لەیەك شوێندا لە قورئانی پیرۆز تێکهەڵکێشان روونادات لە پیتی(راء) وەکـو : ﴿وَقِيلَ مَنْۜ رَاقٍ﴾ چونکـە هێمـای (س) سـەکتەی بۆ دانراوە لە سـەر، پیتی نوونی ساکن لە ڕیوایەتی (حفص من طريق الشاطبية) واجبە دەنگ بپچڕێنی بەبێ هەناسە.

## سێ یەم/ هەڵگەڕانەوە (القلب)

له زمانەوانیدا: بریتیە لە گۆڕینی رووی شتێك بۆ روویەكی تر.

له زاراوەدا: بریتی یە لە هەڵگەڕانەوە دەنگی (نْ) و (ـُـمْ) (ـَـمْ) (ـِـمْ) بۆ (میم)ـێكی شاراوە بە تەواوی لە كاتی گەیشتنیان بە پیتی (بـــاء) بە مەرجێك(مینگە) شی لە گەڵدا بێت، ئینجا (القلب) لە یەك ووشە و لە نێوان دوو وشەدا روو دەدات.

## خشتەی نموونەی (الإقلاب) :

| پیت | لەیەک وشەدا | له دوو وشەدا | لەگەڵ تەنویندا |
|---|---|---|---|
| ب | ﴿لَيُنۢبَذَنَّ﴾ الهمزة: ٤ | ﴿عَنۢ بَعۡضٍ﴾ التحريم : ٣ | ﴿خَبِيرَۢا بَصِيرٗا﴾ الإسراء: ٩٦ |
| | ﴿إِذِ ٱنۢبَعَثَ﴾ الشمس: ١٢ | ﴿يَخۡرُجُ مِنۢ بَيۡنِ ٱلصُّلۡبِ﴾ الطارق: ٧ | ﴿عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ الملك: ١٣ |
| | ﴿وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم﴾ نوح: ١٧ | ﴿يُؤۡمِنۢ بِرَبِّهِۦ﴾ الجن: ١٣ | ﴿عُتُلِّۢ بَعۡدَ ذَٰلِكَ﴾ القلم: ١٣ |

## چوارەم/ شاردنەوە (الإخفاء)

**لە زمانەوانیدا:** واتە شاردنەوەو دەرنەخستن.

**لە زاراوەدا:** بریتیە لە شاردنەوەی دەنگی نونی ساکن ( نْ ) و (تەنوین) ( ـٌ، ـً، ـٍ) کاتێك دەگەن بە یەکێك لەم ( ١٥ ) پیتانەی خوارەوە : (صاد، ذال، ثاء، کاف، جیم، شین، قاف، سین، دال، طاء، زاي، فاء، تاء، ضاد، ظاء)

بە مەرجێك مینگەی لە گەڵدا بێت، لە نێوان دەرخستن (إظهار) و تێك هەڵکێشان (إدغام)ـە، بەڵام بە هیچ شێوەیەك توند ناکرێت و شەددە وەرناگرێت.

پیتەکانیش کۆ کراونەتەوە لە سەرەتای وشەکانی ئەم دێرە هۆنراوە:

صِفْ ذا ثَنا كَمْ جادَ شَخصٌ قَدْ سَما

دُمْ طَيِّباً زِدْ في تُقى ضَعْ ظالماً

## تێبینی/

١- پێویستە لەکاتی (الإخفاء) دا قورئان خوێن زمان بۆ دەرچەی دوای نونی ساکن و تەنوین ئامادە بکات،

بۆ نموونە : پیتی دال :﴿مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ ﴿عِندَ بَارِئِكُمْ﴾.



شێوە و وێنەی دەم و زمان لە شاردنەوەی (نون)ی ساکن لە پیتی (دال).

٢- له شـاردنەوەی نونی سـاكن و تەنوین دەنگێكی كەم (دەنگۆكە) لە دەمەوە دەردەچێت بە هۆی تەواو دانەخرانی دەرچەی نون لە بەشی زمان.

بۆ نموونە : ﴿كُنتُمْ﴾ ﴿وَلَن تَفْعَلُواْ﴾.



شێوە و وێنەی دەم و زمان لە شاردنەوەی (نون)ی ساكن لە پیتی (تاء).

٣- دەنگـی (الغنـــة) قەڵـەو دەبـێ ئەگەر لـە دوایەوە پیتی بـەرز هات، کە ئەمانەن : (قاف، طاء، صاد، ظــاء، ضاد).

٤- دەنگـی (الغنـــة) ناسـك دەبێـت ئەگەر لـە دوایەوە پیتی ناسـك هات کە هەموو پیتـــەکـانی تـری (الإخفـــاء) دەگـرێتـــەوە جگـە لـــەو پێنـــج پیتـــەی خاڵی سێیەم.

٥- لە شاردنەوەی (نون)ـی ساکن و تەنوین دەرچەی پیتی (قاف) دادەخرێ دەنگ لە دەمەوە دەرناچێ بەڵکو لە لووتەوە دەردەچێ،

نموونە: ﴿وَيَنقَلِبُ﴾.



شێوە و وێنەی دەم و زمان لە شاردنەوەی (نون)ـی ساکن لە پیتی (قاف).

له شاردنەوەی نونی ساكن و تەنوین دەرچەی پیتی (كاف) دادەخرێ دەنگ له دەمەوە دەرناچێ بەڵكو له لووتەوە دەردەچێ .

نموونە : ﴿رَسُولٍ كَرِيمٍ﴾.



شێوە و وێنەی دەم و زمان له شاردنەوەی (نون)ی ساكن له پیتی (كاف).

## خشتەی نموونەی پیتەکانی (الإخفاء) :

| پیت | لەیەک وشەدا | لە دوو وشەدا | لەگەڵ تەنویندا |
|---|---|---|---|
| ق | ﴿وَيَنقَلِبُ﴾ الانشقاق: ٩ | ﴿مِن قُوَّةٍ﴾ الطارق: ١٠ | ﴿عَذَابًا قَرِيبًا﴾ النبأ: ٤٠ |
| ك | ﴿مِنكُمْ﴾ التكوير: ٢٨ | ﴿إِن كُلُّ﴾ الطارق: ٤ | ﴿رَسُولٍ كَرِيمٍ﴾ التكوير: ١٩ |
| ش | ﴿أَنشَرَهُۥ﴾ عبس: ٢٢ | ﴿فَمَن شَآءَ﴾ عبس: ١٢ | ﴿يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ﴾ عبس: ٣٧ |
| ج | ﴿أَنجَيْنَا﴾ هود: ١١٦ | ﴿أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ﴾ عبس: ٢ | ﴿فِيهَا عَيْنٌ جَارِيَةٌ﴾ الغاشية: ١٢ |
| ض | ﴿مَّنضُودٍ﴾ هود: ٨٢ | ﴿وَمَن ضَلَّ﴾ يونس: ١٠٨ | ﴿قَوْمًا ضَآلِّينَ﴾ المؤمنون: ١٠٦ |
| ط | ﴿فَٱنطَلَقُوا۟﴾ القلم: ٢٣ | ﴿عَن طَبَقٍ﴾ الانشقاق: ١٩ | ﴿سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا﴾ نوح: ١٥ |
| د | ﴿عِندَ رَبِّهِمْ﴾ القلم: ٣٤ | ﴿مَن دَسَّىٰهَا﴾ الشمس: ١٠ | ﴿وَكَأْسًا دِهَاقًا﴾ النبأ: ٣٤ |
| ت | ﴿مُنتَهَىٰهَآ﴾ النازعات: ٤٤ | ﴿مِن تَسْنِيمٍ﴾ المطففين: ٢٧ | ﴿نَارًا تَلَظَّىٰ﴾ الليل: ١٤ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ص | ﴿يَنصُرُكُم﴾<br>الملك: ٢٠ | ﴿عَن صَلَاتِهِمۡ﴾<br>الماعون: ٥ | ﴿بِرِيحٖ صَرۡصَرٍ﴾<br>الحاقة: ٦ |
| س | ﴿قُتِلَ ٱلۡإِنسَٰنُ مَآ أَكۡفَرَهُۥ﴾<br>عبس: ١٧ | ﴿عَن سَاقٖ﴾<br>القلم: ٤٢ | ﴿قَوۡلٗا سَدِيدٗا﴾<br>الأحزاب: ٧٠ |
| ز | ﴿أَنزَلۡنَٰهُ﴾<br>القدر: ١ | ﴿مَن زَكَّىٰهَا﴾<br>الشمس: ٩ | ﴿نَفۡسٗا زَكِيَّةَۢ﴾<br>الكهف: ٧٤ |
| ظ | ﴿يَنظُرُ﴾<br>النبأ: ٤٠ | ﴿مَن ظُلِمَ﴾<br>النساء: ١٤٨ | ﴿ظِلّٗا ظَلِيلًا﴾<br>النساء: ٥٧ |
| ذ | ﴿أَنذَرۡنَٰكُمۡ﴾<br>النبأ: ٤٠ | ﴿مِن ذِكۡرَىٰهَآ﴾<br>النازعات: ٤٣ | ﴿أَوۡ مِسۡكِينٗا ذَا مَتۡرَبَةٖ﴾<br>البلد: ١٦ |
| ث | ﴿مَّنثُورٗا﴾<br>الانسان: ١٩ | ﴿فَأَمَّا مَن ثَقُلَتۡ﴾<br>القارعة: ٦ | ﴿مَآءٗ ثَجَّاجٗا﴾<br>النبأ: ١٤ |
| ف | ﴿فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكۡرَىٰٓ﴾<br>عبس: ٤ | ﴿مِن فُطُورٖ﴾<br>الملك: ٣ | ﴿كَدۡحٗا فَمُلَٰقِيهِ﴾<br>الانشقاق: ٦ |

# حوكمەكانی میمی ( ساكنْ ) ( م )

یەكەم: تێكهەڵكێشانی لێوی (الإدغام الشفوي)

دووەم: شاردنـــــەوەی لێـوی (الإخفاء الشفوي)

سێ یەم: ئاشكرا كـردنی لێوی (الإظهار الشفوي)

# حوکمەکانی میمی (ساکن) (مْ)

میمی ساکن لەکاتی بەیەک گەیشتنی لەگەڵ هەر پیتێک لە (٢٨) پیتەکانی زمانی عەرەبی سێ جۆر حوکمی هەیە

| الإدغام الشفوي | الإخفاء الشفوي | الإظهار الشفوي |
|---|---|---|
| تێکهەڵکێشانی لێوی<br>مْ + م جووڵە دار | شاردنەوەی لێوی<br>مْ + ب جووڵە دار | بەدیار خستنی لێوی<br>مْ + هەر بیست و شەش پیتەکانی زمانی عەرەبی<br>(أ، ت، ث، ج، ح، خ، د، ذ، ر، ز، س، ش، ص، ض، ط، ظ، ع، غ، ف، ق، ك، ل، ن، هـ، و، ي) |

**یەکەم: تێکهەڵکێشانی لێوی (الإدغام الشفوی)**

بریتیە لە دووپیتی هاوشێوە کە (میم)ـی یەکەمیان (ساکن)ـە و دووەمیان بزواو (متحرك)ـە واتە هەردوو (میم)ـەکە دەبن بە میمێکی توند و شەددەدار بە ئەندازەی دووجووڵە(حرکة) مینگە (غنـة) لەو پەڕی تەواوی پێ دەدرێت، ئەم جۆرەش تەنها لە نێوان دوو وشە روو دەدات.

**خشتەی نموونەی (الإدغام الشفوی) :**

| پیت | نموونـــــــە | ســـورەت |
|---|---|---|
| م + مَ | ءَأَمِنتُم مَّن | (١٦) الملك |
| م + مِ | خَلَقْنَٰهُم مِّمَّا | (٣٩) المعارج |
| م + مُ | إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ | (٢٣) المائدة |

## دووەم: شاردنەوەی لێوی (الإخفاء الشفوي)

بریتیه له هاتنی پیتی (بـــاء) له دوای پیتی (میم)ــی ساكن، به جۆرێك (میم)ــەكه بشارێتەوه و لەگەڵ مانەوەی مینگه، بۆشایی نەمێنێ له نێوان لێوەكان بەڵام به بێ ئەوەی فشار بخرێته سەریان، ئەمەش تەنها له نێوان دوو وشه روودەدات.



شـێوەی دوو لێوەكان له كاتی دەربڕینی (میم)ــی شـاراوه به گەیاندنی دوو لێوەكان به بێ بوونی فشار وهێشتنەوەی بۆشایی له نێوان دوو لێوەكاندا.

لــه رووی كرداریــەوه هیــچ جیاوازیەك نیــه له نێوان (الاخفاء الشـفوي) و (القلب) بەڵام له رووی (حوكم)ـەوه جیاوازن بەم شێوەی خوارەوه:

-القلب: نونی ساكن و تەنوین دەگۆڕێت بۆ(میم)ێكی شاراوه به تەواوی.

- الاخفاء الشفوي : له خودی خۆی میمێكی بنەڕەتی یه (أصلي)یه.

(الاخفاء الشفوي) تەنها له نێوان دوو وشه روودەدات.

### خشتەی نموونەی (الإخفاء الشفوی) :

| سـوڕەت | نموونــه | پیت |
|---|---|---|
| (٤) الفیل | ﴿تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ﴾ | م + بِ |
| (١٦) الغافر | ﴿هُم بَـٰرِزُونَ﴾ | م + بَ |
| (٦١) النور | ﴿دَخَلْتُم بُيُوتًا﴾ | م + بُ |

## سێ یەم: ئاشکرا کردنی لێوی (الإظهار الشفوي)

بریتیە لە ئاشکرا کردنی (میم)ـی ساکن لە کاتی گەیشتنی بە پیتێك لە (٢٦) پیتەکانی زمانی عەرەبی جگە لە پیتی (میم، باء) ئینجا (الإظهار الشفوي) لە یەك وشە ولە دوو وشە روودەدات بە پێچەوانەی (الإدغام الشفوي) و (الإخفاء الشفوي).

### خشتەی نموونەی (الإظهار الشفوي) لە یەک وشەدا :

| پیت | نموونە لەیەک وشەدا | سورەت |
|---|---|---|
| ء | ﴿ٱلظَّمۡـَٔانُ﴾ | النور: ٣٩ |
| ت | ﴿أَنۡعَمۡتَ﴾ | الفاتحة: ٧ |
| ث | ﴿ٱلۡأَمۡثَالَ﴾ | إبراهيم: ٤٥ |
| ح | ﴿يَمۡحَقُ﴾ | البقرة: ٢٧٦ |
| ر | ﴿لِكُلِّ ٱمۡرِيٍٕ﴾ | عبس: ٣٧ |
| ز | ﴿رَمۡزًا﴾ | آل عمران: ٤١ |
| س | ﴿ٱلشَّمۡسُ﴾ | التكوير: ١ |
| ش | ﴿يَمۡشِي﴾ | النور: ٤٥ |
| ض | ﴿وَٱمۡضُواْ﴾ | الحجر: ٦٥ |

| | | |
|---|---|---|
| ط | ﴿وَأَمْطَرْنَا﴾ | الحجر: ٧٤ |
| ع | ﴿بِسَمْعِهِمْ﴾ | البقرة: ٢٠ |
| ك | ﴿وَيَمْكُرُونَ﴾ | الأنفال: ٣٠ |
| هـ | ﴿أَمْهِلْهُمْ﴾ | الطارق: ١٧ |
| ن | ﴿مَمْنُونٍ﴾ | الانشقاق: ٢٥ |
| ل | ﴿لَا يَمْلِكُونَ﴾ | النبأ: ٣٧ |
| و | ﴿أَمْوَاتٌ﴾ | البقرة: ١٥٤ |
| ي | ﴿عُمْيٌ﴾ | البقرة: ١٨ |

**تێبینی/**

١- لە زانستی تەجوید شتێك نیە پێی بگوترێ زۆر ئاشكرا كردن و خستنە روو چونكە ئاشكرا كردن دیارە.

٢- پێویستە قورئان خوێن وریا بێت لەوەی كە نابێ پیتی (میم) بشارێتەوە لە كاتی گەیشتن بە پیتی (فاء) و (واو) چونكە پیتی (میم) شوێنی دەرچوونی لە گەڵ (واو) یەكەو لە گەڵ پیتی (فاء) نزیكە.

خشتەی نموونەی دووەمی (الإظهار الشفوی) له دوو وشەدا :

| پیت | نموونه لەدوو وشــەدا | ســورەت |
|---|---|---|
| ء | أَيُّكُمْ أَحْسَنُ | الملك : ٢ |
| ت | وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ | آل عمران: ٧٩ |
| ث | أَشُدَّكُمْ ثُمَّ | غافر: ٦٧ |
| ج | لَهُمْ جَنَّٰتٍ | البقرة: ٢٥ |
| ح | فِيٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ | المعارج: ٢٤ |
| خ | هُمْ خَيْرُ ٱلْبَرِيَّةِ | البينة: ٧ |
| د | وَأَنتُمْ دَٰخِرُونَ | الصافات: ١٨ |
| ذ | رَّبُّكُمْ ذُو رَحْمَةٍ | الأنعام: ١٤٧ |
| ر | قَدْ جَآءَكُمْ رَسُولُنَا | المائدة: ١٥ |
| ز | مِّنْهُمْ زَهْرَةَ | طه: ١٣١ |
| م + س | وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا | النبأ: ١٢ |
| ش | وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَآءَ | آل عمران: ١٤٠ |
| ص | إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ | الملك: ٢٥ |
| ض | فَرَاغَ عَلَيْهِمْ ضَرْبًۢا | الصافات: ٩٣ |

| | | |
|---|---|---|
| ط | لَكُمْ طَالُوتَ | البقرة: ٢٤٧ |
| ظ | فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ | آل عمران: ١٢٨ |
| ع | وَيَنصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ | التوبة: ١٤ |
| غ | فَإِنَّكُمْ غَٰلِبُونَ | المائدة: ٢٣ |
| ف | وَهُمْ فِيهَا | الأنبياء: ١٠٠ |
| ق | أَوْ هُمْ قَآئِلُونَ | الأعراف: ٤ |
| ك | مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ | القلم: ٣٦ |
| ل | أَمْ لَهُمْ | القلم: ٤١ |
| ن | أَلَمْ نَجْعَلِ | النبأ: ٦ |
| ه | أَخَاهُمْ هُودًا | الأعراف: ٦٥ |
| و | عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَعَلَىٰ | البقرة: ٧ |
| ي | وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ | البقرة: ٣ |

# پلەکانی مینگە (غنــة)

پلەی یەکەم : لەو پەڕی تەواوی (أكمل ما تكون)

پلــەی دووەم : تـــــەواو (كـامـــــل)

پلەی سێ یەم: نـــاتەواو (نـــاقـص)

پلەی چـوارەم : ناتەواوترین (أنقـــــص)

# پلەکانی مینگە (غنة)

| (انقص) نا تەواوترین | (ناقص) نا تەواو | (کامل) تەواو | (أکمل ماتکون) لەو پەڕی تەواوی دایە |
|---|---|---|---|

**پلەی یەکەم : لەوپەڕی تـەواوی دایە (أکمل ما تکون) .**

لە پیتی (نّ ، مّ)ی توند و شەددەدار لەوپەڕی تەواوی دایە.

نموونە : ﴿كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ﴾ المرسلات: ٣٣، ﴿ثُمَّ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ﴾ النبأ: ٥.

لە تێکهەڵکێشانی (نـون) لەگەڵ (نـون)ـدا و (میم) لەگەڵ (میم)ـشدا (مینگە) لەوپەڕی تەواوی دایە.

نموونە: ﴿ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ﴾ الملك: ١٦، ﴿فَلَن نَّزِيدَكُمْ﴾ النبأ: ٣٠، ﴿كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ﴾ المطففين: ٩.

**پلەی دووەم : تەواو (کامل).**

لە سێ (حکم)ـدا مینگە تەواوە.

أ- لە کاتی (الإدغام) تێکهەڵکێش کردنی نوونی (ساکن) و (تەنوین) لەگەڵ پیتی (واو، یاء) .

نموونە: ﴿شَيْـًٔا وَلَا يُنقِذُونِ﴾ يس: ٢٣، ﴿أَفَمَن يَمْشِي﴾ الملك: ٢٢.

ب – له كاتی شاردنەوەی (الإخفاء) (میم ، نون)ی ساكن.

نموونە: ﴿أَنشَأَكُمْ﴾ الملك: ٢٣، ﴿فَمَن يَأْتِيكُم بِمَآءٍ مَّعِينٍ﴾ الملك: ٣٠.

ج- له كاتی هەڵگەڕانەوەی (نـون)ی ساكن و (تەنوین) بۆ پیتی (میم) بە تەواوی.

نموونە: ﴿عُتُلٍّ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ﴾ القلم: ١٣، ﴿مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ﴾ الجن: ٢٧.

## پلەی سێ یەم: ناتەواو (ناقص) .

له كاتی ئاشكرا كردنی (الإظهار) دەنگی (نون، میم)ی ساكن ناتەواوە.

نموونە: ﴿مِنْهُ﴾ المزمل: ٣، ﴿وَٱهْجُرْهُمْ هَجْرًا﴾ المزمل: ١٠.

## پلەی چوارەم: ناتەواوترین (أنقص) .

له (نون، میم)ی جووڵەدار كەمترین پلەی (مینگە)ی هەیە.

نموونە: ﴿يَوْمَ﴾ المزمل: ١٤، ﴿نُقِرَ﴾ المدثر: ٨.

بەیارمەتی خوا قۆناغی یەكەم كۆتایی هات

بسم الله الرحمن الرحيم

وقرآنا فرقناه لتقرأه على الناس على مكث ونزلناه تنزيلا

## إجازة القراءاة السبع من طريق الشاطبية

الحمد لله الذي جعل أهل القرآن من أهله وخاصته ، ورفع منزلتهم على سائر الناس وأحاطهم بفضله ورحمته ، والصلاة والسلام على سيد التالين للقرآن سيدنا محمد وعلى صحبه وعترته، وعلى من تبعهم بإحسان فتلا القرآن حقّ تلاوته ، وبعد:

فقد قرأ عليّ الأخ (توفيق صديق حمد خوشناو) القرآن الكريم من أوله الى آخره بالقراءات السبع من طريق الشاطبية بالسند المتصل الى رسول الله ﷺ ولما وثقت من أهليته أجزته بالإقراء بالشرط المعتبر عند العلماء. وأوصي الأخ المجاز بتقوى الله في السرّ والعلن ، والمداومة على التلاوة والإقراء والتخلق بأخلاق القرآن الكريم والعمل بما علم، ونسأل الله عزّ وجلّ أن ينفع به الإسلام والمسلمين، وأن يجعلنا جميعاً من أهل القرآن.

حررت هذه الإجازة بتاريخ/7/ ذي القعدة/ 1437 الهجرية الموافق /10/ آب /2016 الميلادية

المجيز: خادم القرآن الكريم

سالم محمد علي حسين (الكوجر)

# مۆڵەتی قیرائەتی ئیمام (عاصم) بەڕیوایەتی (شعبة و حفص)



بسم الله الرحمن الرحيم

إجازة خطية

إجازة بقراءة الامام عاصم براوييه شعبة وحفص

الحمد لله القائل ﴿وَقُرْآنًا فَرَقْنَاهُ لِتَقْرَأَهُ عَلَى النَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ وَنَزَّلْنَاهُ تَنزِيلًا﴾ والصلاة والسلام على سيد الخلق وحبيب الحق سيدنا محمد المنزل عليه القرءان القائل حاكيا عن رب العالمين (( من شغلة القرآن عن مسألتي أعطيته افضل ما أعطي السائلين)) وعلى آله وأصحابه المتبعين الى يوم الدين والذين اتخذوا القرءان منهجا وسبيلا فصدقوا ما عاهدوا الله عليه وما بدلوا تبديلا ومن سار على نهجهم فكان اشد التزاما واقوم قيلا. اما بعد:

فلقد قرأت الأخ (توفيق صديق محمد حوشان) القرءان الكريم من اوله الى اخره بقراءة الامام عاصم بن ابي النجود الكوفي من طريق الشاطبية بالسند المتصل الى رسول الله صلى الله عليه وسلم ولما وثقت من اهليته اجزته بالاقراء بالشرط المعتبر عند العلماء.

واوصي الأخ المجاز بتقوى الله في السر والعلن، والمداومة على التلاوة والاقراء والتخلق بآداب القرءان الكريم والعمل بما علم سائلين الله عز وجل ان ينفع به الاسلام والمسلمين

حررت هذه الاجازة بتاريخ/12 / محرم الحرام/ 1433 الهجرية ،الموافق/7 /كانون الثاني /2011 الميلادية

المجيز العبد الفقير

سالم محمد علي حسين الكوجر

## مۆڵەتی ڕیوایەتی (حفص عن عاصم) لەڕێگەی (الشاطبية)

بسم الله الرحمن الرحيم

اجازة برواية حفص عن عاصم من طريق الشاطبية

الحمد لله الذي علم القرءان خلق الانسان علمه البيان،والصلاة والسلام على خير الانام محمد صلى الله عليه وسلم القائل:(خيركم من تعلم القرءان وعلمه )،وعلى اله وصحبه، ومن تبعهم باحسان الى يوم الدين، وبعد:

فلقد اقرات الاخ (**توفيق صديق حمد خوشناو**) القرءان الكريم من أوله الى اخره برواية حفص عن عاصم من طريق الشاطبية بالسند المتصل الى رسول الله صلى الله عليه وسلم ولمّا وثقت من اهليته أجزته بألاقراء بالشرط المعتبر عند العلماء.

وأوصي الاخ المجاز بتقوى الله في السرّ والعلن ،والمداومة على التلاوة والاقراء والتخلق بأداب القرءان الكريم والعمل بماعلم،سائلين الله عزّ وجلّ ان ينفع به الاسلام والمسلمين.

حررت هذه الاجازة بتاريخ/١ / شعبان/ ١٤٣١ الهجرية الموافق/١٣/ ٧/ ٢٠١٠الميلادية

مصدقة من قبل لجنة تصديق اجازة قراءات القرآن .

المجيز خادم القرءان

حمزة عبد الرحمن صوفي خوشناو

مؤلَّفتي (متن الجزري)

بسم الله الرحمن الرحيم



# إجازة

الحمد لله وحده والصلاة والسلام على من لا نبي بعده أما بعد :

يقول العبد المفتقر الى عفو ربه : **دلير بن أحمد بن محمد الجمور :**

**قد جاءني الأخ الفاضل /** توفيق صديق حمه

واخذ علي كتاب المقدمة الجزرية مابين قراءة وسماع واجازة وطلب مني ذكر سندي واتصالي بالإمام شمس الدين أبو الخير محمد بن محمد بن محمد بن علي بن يوسف الجزري والإجازة الخاصة بذلك وألح علي في الطلب ، وما درى أني لست أهلا لذلك، ولم يسعني غير إسعاده لنيل مراده طمعا في الحصول دعوة صالحة منه عن ظهر الغيب، وتكثير سواد أهل العلم .

فاقول: أرويه عن شيخي ابراهيم محمد شيت الحيالي وهو يرويه عن المحدث العلامة الشيخ حسين بن عبدالرحيم القلمياني وهو عن محدث الحرمين الشريفين الشيخ عمر بن حمدان المحرسي وهو عن شيخه محمد عابد بن حسين المالكي عن السيد أحمد بن زيني دحلان عن الشيخ عثمان الدمياطي عن العلامتين : محمد الأمير الكبير وعبدالله بن حجازي الشرقاوي كلاهما عن الشيخ عطية الله بن عطية الأجهوري عن أحمد بن عبدالفتاح الملوي عن عبدالله بن سالم البصري عن عيسى المغربي الثعالبي عن سلطان بن أحمد المزاحي عن سيف الدين بن عطاء الفضالي عن الشيخ شحاذة اليمني عن الشيخ ناصر الدين الطبلاوي عن شيخ الإسلام زكرياء الانصاري عن أبي العباس أحمد النويري عن المولف شمس الدين أبي الخير محمد بن محمد بن علي بن يوسف الجزري رحمه الله .

ولما كانت الإجازة – أحد الأوجة الثمانية في تحمل– سنة جارية وعادة مألوفة بين العلماء مع تفاوت رتبهم، بادرت بإجابة ذلك الطلب فأتحفته بهذا قائلا:

قد أجزت الأخ المذكور – ضاعف الله لي وله الأجور – اجازة خاصة لكتاب المقدمة الجزرية ، وله أن يجيز بذلك من شاء من أهل العلم والفضل ، فرب مبلغ أوعى من سامع ، وأوصيه أن لاينساني من صالح دعواته في خلواته وجلواته خصوصا عقب الدروس العلمية وخلف الصلوات المفروضة .

والله أسأل أن يوفقنا جميعا لما فيه خير الإسلام والمسلمين ، وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم.

حرر في ١١/ جمادى الآخرة/ ١٤٣٥ هـ

١٢/ ٣/ ٢٠١٤ م

أمر بكتابتها الراجي عفو ربه المنان

دلير بن أحمد بن محمد الجمور

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على المبعوث رحمة للعالمين... وبعد فيقول راجي رحمة الباري:

[أبو أنس هاندر بن عبد الخالق بن محمد الكردي] المولود في (1984/11/17م،

بمحافظة أربيل/ كردستان العراق)، إنّ الأخ الكريم والأستاذ الفاضل [أبو أحمد توفيق بن صديق بن حمد] المولود في (16 / 1 / 1978م- في كردستان العراق) قد جاءني رزقني الله وإياه حسن الختام، وأفاض عليّ وإيّاه بفيض الرضوان والغفران، ليتلقى القرآن الكريم بروايتي شعبة وحفص عن عاصم من طريق الشاطبية بالسند المتصل إلى النبيﷺمع بيان الأحكام ودلائلها حسبما تلقيتُ، وعلى الرغم من قلة البضاعة وكساد الصناعة أجبته إلى ما أراد فقرأ عليّ القرآن الكريم كاملا بالإتقان والتجويد والإحسان - حفظًا عن ظهرِ غيبه - وأتمّ بعون الله وعنايته وتوفيقه وأجاد وأساد وأكمد الحساد وصار على غاية من الإتقان وخاض في بحر القرآن وطلب الإجازة فأجزته بأن يقرأ ويقرئ، ويعلم ويدرس ما قرأه عليّ في أي زمان ومكان وفي أي عصر ومصر بلا منازع ولا معارض له أبداً، إجازة صحيحة بشروطها المعتبرة عند علماء الأثر.

وقد أخبرتُ الأستاذ المجازَ أنّي تلقيتُ القرآن الكريمَ بروايتي شعبة وحفصٍ عن عاصمٍ (حفظًا عن ظهرِ الغيب) - أثناء إقامتي بالقاهرة/ مصر، لدراسة الماجستير في فترة 2014-2011 - عن الشيخ أحمد بن عبد الله من دار الأرقم بن الأرقم بالمعادي، وهو على الشيخ حمزة بن جمال بن عبد العاطي، وهو على الشيخ عامر السيد وهو بسنده المتصل إلى رسول الله ﷺ عن أمين الوحي جبريل عليه السلام عن اللوح المحفوظ عن ربِّ العزّة جل جلاله وتقدّست أسماؤه.

وكان الانتهاء من هذه الختمة المباركة:
ليلة الثلاثاء/20/شعبان/1438هـ، الموافق 2017/5/15م

| المجاز | المجيز |
| --- | --- |
| أبو أحمد | أبو أنس |
| توفيق بن صديق بن حمد | هاندر بن عبد الخالق |
| | بن محمد الكردي |

# مۆڵەتی (متن الجزري)

## إجازة
## في متن المقدمة الجزرية

الحمد لله والصلاة والسلام على المبعوث رحمة للعالمين،، وبعد فيقول راجي رحمة الباري:
[أبوأنس هاندر بن عبد الخالق بن محمد الكردي] المولود في (17 /11 /1984م، بمحافظة أربيل/
كردستان العراق). إنَّ الأخ الفاضل والأستاذ الكريم [أبو أحمد توفيق بن صديق بن حمد]
المولود في (16 /1 /1978) قد جاءني وقرأ عليَّ منظومة "المقدمة، فيما على قارئه أن
يعلمه" للإمام "محمد بن الجزري" غيباً عن حفظه- في مجلس واحد -، ثمَّ استجازني بذلك
لروايته ونشره بالسند المتصل إلى الإمام الناظم (محمد بن الجزري)، فأجزته بأن يقرأها ويعلمها ويرويها
عني لمن يستحق من طلاب هذا العلم، وأخبرته: أني خلال دراستي الماجستير بالقاهرة/ مصر في فترة
(سبتمبر -2011 سبتمبر 2014) تلقيتها عن (14) شيخي مستشار شئون القرآن بالجيزة المصرية، وعميد
معهد معلمي القرآن بأبي النمرس، وآخر تلاميذ الإمام الضباع الموجودين في عصره، ومن أعلى
القراء سنداً بالديار المصرية الشيخ (عبدالفتاح بن مدكور بن بيومي (1932م- ) وهو
عن (13) شيخه (الإمام نور الدين علي بن محمد الشهير بالضباع (1307-1380هـ = 1886-1961م)،
وهو عن (12) الشيخين (عبد الرحمن الخطيب الشهير بالشعار، وحسن بن يحيى الكتبي صهر
المتولي) وهما عن (11) شيخ المقارىء بالديار المصرية (محمد بن أحمد بن الحسن بن سليمان
الشهير بالمتولي (1248هـ تقريباً- 1313هـ)، وهو عن (10) الشيخ (السيد أحمد بن محمد المالكي
الأزهري الشهير بالدري التهامي (كان حياً 1269هـ- وتوفي قبل 1284هـ)، وهو على (9) الشيخ
(أحمد بن محمد المالكي الشهير بسلمُونة (كان حياً عام 1254هـ) ، وهو عن (8) شيخ المقارىء
بالديار المصرية في زمنه (السيد إبراهيم العبيدي (كان حياً 1232هـ)، وهو عن (7) الشيخ
(عبد الرحمن بن حسن الأجهوري المالكي (ت 1198هـ)، وهو عن (6) الشيخ (أبي السماح أحمد
البقري الشافعي (ت بعد 1140هـ)، وهو عن(5) الشيخ (شمس الدين محمد بن عمر بن قاسم
البقري الشناوي الشافعي (1018-1111هـ)، وهو عن (4) الشيخ [ عبد الرحمن بن شحاذة اليمني
الشافعي 975-1050هـ)، وهو عن (3) الشيخ علي بن محمد خليل بن غانم
المقدسي 920-1004هـ)، وهو عن (2) الشيخ ( أبي الجود محمد بن إبراهيم السنديسي
الحنفي 853-932هـ)، وهو عن (1) الشيخ ( شهاب الدين أبو العباس أحمد بن أسد بن
عبد الواحد الأسيوطي الإسكندري القاهري الشافعي(808-872هـ)، وهو عن الإمام الناظم، حجة
القراء، شيخ الكل، شمس الملة والدين أبي الخير (محمد بن محمد بن محمد بن علي بن يوسف
الدمشقي المعروف بابن الجزري (751-833هـ).
هذا وأوصيه بتقوى الله تعالى، وأن يعرف قدر ما وصل إليه، وأن ينشر القرآن والقراءات بين إخوانه.
وصلى الله على خليل الرحمن وخاتم الأنبياء وسيدهم وأشرف الخلق
محمد وعلى آله وصحبه أجمعين، والحمد لله ربّ العالمين.

المجيز

تمّ تحريره في يوم الأثنين بتاريخ:
16/محرم/1438هـ، الموافق: 17 /10/ 2016م.

المجاز

أبو أنس
هاندر بن عبد الخالق
بن محمد الكردي

أبو أحمد
توفيق بن صديق بن حمد

# مۆڵەتی (متن تحفة الاطفال)

## إجازة
## في متن تحفة الأطفال

الحمد لله والصلاة والسلام على المبعوث رحمة للعالمين... وبعد فيقول راجي رحمة الباري:(أبو أنس هاندر بن عبد الخالق بن محمد الكردي) المولود في (1984/11/17م، بمحافظة أربيل/ كردستان العراق)،

إنّ الأخ الكريم والأستاذ الفاضل (أبو أحمد توفيق ) المولود في ( في كردستان العراق)

قد جاءني وقرأ عليّ منظومة "تحفة الأطفال" للإمام "سليمان الجمزوري" غيباً عن حفظه-في مجلس واحد-، ثمّ استجازني بذلك لروايته ونشره بالسند المتصل إلى الإمام الناظم (سليمان الجمزوري)، فأجزته بأن يقرأها ويعلمها ويرويها عني لمن يستحق من طلاب هذا العلم، وأخبرته: أني خلال دراستي الماجستير بالقاهرة/ مصر في فترة (سبتمبر -2011 سبتمبر 2014) تلقيتها عن (1)شيخ مستشار شئون القرآن بالجيزة المصرية، وعميد معهد معلمي القرآن بأبي النمرس، وآخر تلاميذ الإمام الضباع الموجودين في عصره، ومن أعلى القراء سنداً بالديار المصرية الشيخ (عبدالفتاح بن مدكور بن بيومي (1932م-) وهو عن (2) شيخه (الإمام نور الدين علي بن محمد الشهير بالضباع (1307-1380هـ = 1886-1961م)، وهو عن (3) الشيخين (عبد الرحمن الخطيب الشهير بالشعار، وحسن بن يحيى الكتبي صهر المتولي) وهما عن (4) شيخ المقارىء بالديار المصرية (محمد بن أحمد بن الحسن بن سليمان الشهير بالمتولي (1248هـ تقريباً- 1313هـ)، وهو بسنده إلى الإمام الناظم سليمان بن حسين بن محمد الجمزوري الشهير بالأفندي.

هذا وأوصيه بتقوى الله تعالى، وأن يعرف قدر ما وصل إليه، وأن ينشر القرآن والقراءات بين إخوانه.

وصلى الله على خليل الرحمن وخاتم الأنبياء وسيدهم وأشرف الخلق

محمد وعلى آله وصحبه أجمعين، والحمد لله ربّ العالمين.

المجاز

تمّ تحريره في ليلة الثلاثاء بتاريخ:
6/ربيع الأول/1438هـ، الموافق: 5 /12/ 2016م.

المجيز

أبو أحمد
توفيق بن صديق بن حمد



أبو أنس
هاندر بن عبد الخالق
بن محمد الكردي

# ليستى سەرچاوەكان


١- مصحف المدينه .
٢- أحكام قراءة القران الكريم : الشيخ محمود خليل الحصري.دار البشائر الاسلامية . ط ٨ ، ١٤٢٧هـ - ٢٠٠٦م .
٣- آداب إسلامية : محمد أحمد عبود. دار المجتمع للنشر والتوزيع .
٤-بغية المريد من أحكام التجويد : الدكتورالمهدى محمد يوسف الحرازي. دار البشائر الاسلامية ، ط ٢ ، ١٤٢٧هـ - ٢٠٠٦م .
٥- التبيين في أحكام تلاوة الكتاب المبين : الشيخ عبداللطيف فايز دريان. دار المعرفة ، ط ١ ، ١٤٢٠هـ - ١٩٩٩م.
٦- تەفسیرى ئاسان: برهان محمد أمين. بلاوكراوه كانى كتێبخانەى رۆشنبير .
٧- التجويد المصور : د.أيمن رشدي سويد. مكتبة إبن الجزري ، ط ١ ، ١٤٣٢هـ - ٢٠١١م.
٨- تعليم القاري : الشيخ محمد البارودي. دار ابن الحزم ، ط ١ ، ١٤٣٢هـ - ٢٠١١م .
٩- تيسير أحكام التجويد (المستوى الأولى) : د. يحيى عبدالرزاق الغوثاني. دار الغوثاني للدراسات القرآنية ، ط ١ ، ١٤٢٤هـ - ٢٠٠٣م.
١٠- تيسير الرحمن في تجويد القرآن : د. سعاد عبدالحميد. دار التقوى ، ط ١ ، ١٤٣٠هـ - ٢٠٠٩م.
١١- تيسير علم التجويد : الشيخ أحمد بن احمد محمد عبدالله. دار إبن خزيمة. ط ٢ ، ١٤٢٣هـ - ٢٠٠٢م .
١٢-جامع شروح المقدمة الجزرية في علم التجويد.شرح أصحاب الفضيلة: (خالدالازهري ، زكرياالانصاري ) : الشيخ محمد بن محمد بن محمد بن علي بن يوسف أبن الجزري. دار ابن الجوزي ، ط ١ ، ١٤٢٩هـ - ٢٠٠٨م.
١٣- جداول أحكام التلاوة والتجويد : مديحة صالح مهدي.دار طيبة الخضرا ، ط ٢ ، ١٤٣٣هـ - ٢٠١٢م.
١٤- الجواهر المضية على المقدمة الجزرية : سيف الدين بن عطاء الله الفضالي المصري البصير. مكتبة الرشد ، ط ١ ، ١٤٢٦هـ -٢٠٠٥م.
١٥- حلية التلاوة في تجويد القرآن : د. رحاب محمد مفيد شققي. مكتبة روائع المملكة ، ط ٤ ، ١٤٣١هـ - ٢٠١٠م.
١٦- الدُررُ البهية في التعريفات التجويدية : هشام عبدالباري محمد راجح . دار العالمية ، ط ١ ، ١٤٣١هـ - ٢٠١٠م.
١٧- الدقائق المحكمات في المخارج والصفات : هشام عبدالباري محمد راجح. دار لايمان.
١٨- الشرح العصري على مقدمة ابن الجزري : محمد بن محمود حوا. دار ابن الحزم ، ط ١ ، ١٤٢٩هـ - ٢٠٠٨م.
١٩- الشرح الوجيز على المقدمة الجزرية : الدكتور غانم قدوري الحمد. مركز الدراسات والمعلومات القرآنية بمعهد الامام الشاطبي ، ط ١ ، ١٤٣٠هـ - ٢٠٠٩م.

٢٠- علم التجويد (المستوى الثاني) : د. يحيى عبدالرزاق الغوثاني. دار الغوثاني للدراسات القرآنية . ط ٤ ، ١٤٢٥ هـ - ٢٠٠٤م.
٢١- الفرائد الحسان في تجويد القران : محمد نور بن عبدالحفيظ سويد. دار إبن كثير ، ط ١ ، ١٤٢٧هـ - ٢٠٠٦م.
٢٢- المبتكر المفيد في علم التجويد : حياة بنت خليل بن محمد بن حسين. دار الغوثاني للدراسات القرآنية ، ط ٣ ، ١٤٣٨هـ - ٢٠١٧م.
٢٣- المختصر الوافي من هداية القاري الى تجويد كلام الباري : الشيخ عبدالفتاح المرصفي. دار الغوثاني للدراسات القرآنية ، ط ١ ، ١٤٣١هـ - ٢٠١٠م.
٢٤- المُذكرة في التجويد : د. محمد نبهان بن حسين مصري. دار محوى٢ ، ط الرابعة والخمسون ، ١٤٣٠هـ - ٢٠٠٩م.
٢٥- المنير في أحكام التجويد : جمعية المحافظة على القران الكريم. ط ١٨ ، ١٤٣١هـ - ٢٠١٠م. ط ٢٢ ، ١٤٣٤هـ - ٢٠١٣م.
٢٦- الواضح في أحكام التجويد : الدكتور محمد عصام مفلح القضاة. دار النفائس ، ط ٤ ، ١٤٢٤هـ - ٢٠٠٣م.

# نـــــــاوەرۆک

## خوێنەری بەڕێز :

- سوپاس و ستایش بۆ خودای پەروەردگار کە یارمەتی داین بۆ ئامادەکردنی ئەم پەرتووکە بۆ ئەوەی زیاتر فێرخواز ئاشنایی لەگەڵ زانستی (تجويد) دروست بکات و بە شێوەیەکی ئاسان تێی بگات .

- ناکرێ و نابێ قورئانی مەزن  بە ویست و ئارەزووی خۆمان بیخوێنینەوە ، بەڵکو خوێندنەوەی قورئانی مەزن تایبەتمەندی خۆی هەیە .

- ئاکە زانستە لە ڕووی کرداری کە فێرخواز بە بێ بوونی مامۆستا جوان فێری نابێ چونکە زانستی (تجويد) لە هەموو زانستەکانی تر جیایە ، بۆیە فێربوونی پێویستی بە مامۆستای شارەزا و لێزان هەیە .

- هیوادارین مامۆستایان و فێرخوازانی بەڕێز نزای بە خێرمان بۆ بکەن و، وە لە تێبینی بەسوود بێ بەشمان نەکەن بە هیوای سوود بۆ هەموو لایەک .

دەزگای نوری حیکمە بۆ پەروەردە و ڕۆشنبیری
NFEC
2007 1428
مؤسسة نور الحكمة للتربية والثقافة